٤

حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق
وەزارەتی پەروەردە - بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# بیرکاری بۆ هەمووان

## کتێبی قوتابی

پۆلی چوارەمی بنەڕەتی- بەرگی یەکەم




Student Book

٤



حکومەتی هەرێمی کوردستان- عیراق
وەزارەتی پەروەردە - بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# بیرکاری بۆ هەمووان

## کتێبی قوتابی

پۆلی چوارەمی بنەڕەتی- بەرگی یەکەم



چاپی نۆیەم
٢٠١٦ز /٢٧١٦کوردی /١٤٣٧هـ

# ناوەڕۆك

## بەرگی یەکەم

## ١ ژمارە گەورەکان
## Greater Numbers



## ٢ کۆکردنەوە و لێدەرکردنی ژمارە گەورەکان
## Add and Subtract Greater Numbers





# ٣ چارەسەرکردنی پێدراوەکان و کات
## Processing Data and Time



# ٤ لێکدان لە ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی
## Multiply by 1-Digit Number





# ٥ لێکدان لە ژمارەیەکی دوو ڕەنووسی
## Multiply by 2-Digit Number



# ٦ دابەشکردن بەسەر ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی
## Divide by 1-Digit Number





بەشى ١

# ژمارە گەورەكان Greater Numbers




له ١٤ى ئابى سالّى ١٩٢١ دەولّەتى عێراقى نوێ دامەزرا، ئەم خشتەیەی خوارەوە ڕووبەری چەند پارێزگایەك بە كیلۆمەتری چوارگۆشە ڕوون دەكاتەوە.

شیكاری پرسیارەكان دووبارە خشتەكە بەپێی ڕووبەرەكان لە گەورەوە بۆ بچووك ڕیزبكە.

| پارێزگا | ڕووبەر «بە كم چوارگۆشە» |
|---|---|
| موسل | ٣٧٣٢٣ |
| بەغدا | ٧٣٤ |
| بەسرا | ١٩ ٠٧٠ |
| كەركووك | ١٠ ٢٨٢ |
| ڕەمادى | ١٣٨ ٥٠١ |
| هەولێر | ١٤ ٤٧١ |
| سلێمانى | ١٧ ٠٢٣ |

# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know

ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون
لە هەبوونی ئەم زانیارییانەی پێویستە بۆ ئەم بەشە.

## زاراوەکان Vocabulary

| |
|---|
| ڕەنووسی Digits |
| پیتی Word |
| بەدرێژی Expanded |
| سەدان Hundreds |
| < |
| > |
| بچووکترە لە Less than |
| گەورەترە لە Greater than |

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

١ ڕەنووسی ٦ لە ژمارە ٨٦٤٠ دەکەوێتە خانەی ___؟___ .

٢ هێمای بچووکترە لەبریتییە لە ___؟___ .

٣ شێوەی ___؟___ بۆ ژمارەی ٧٣١ بریتییە لە ١ + ٣٠ + ٧٠٠ .

٤ هێمای ___؟___ بریتییە لە > .

## بەهای خانەیی Place Value

بەهای ڕەنووسی شین بنووسە.

٥ ٥ ٠٢٤ ٦ ٣ ٩٣٤ ٧ ٣٠٠١ ٨ ٩ ٣٥٦

## خوێندنەوە و نووسینی ژمارەکان Reading and Writting Numbers

لەسەر شێوەی ڕەنووسی بنووسە.

٩ سەد و چل وشەش ١٠ دوو هەزار و حەفتا ١١ شەش هەزار و سێ سەد و چل و نۆ

لەسەر شێوەی درێژی بنووسە.

١٢ ٦٤٣ ١٣ ٣ ٣١١ ١٤ ٢ ٠٤٠ ١٥ ٣ ١٠٥

## بەراوردکردنی ژمارەکان Compare Numbers

بەراورد بکە و هێمای < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

١٦ ٤٧٦ ● ٦٤٧ ١٧ ٧ ٩١٦ ● ٧ ٦٩١ ١٨ ٤ ٩٧٨ ● ٥ ٧٧٧

## نزیککردنەوەی ژمارەکان Round Numbers

نزیکبکەوە بۆ نزیکترین دە

١٩ ٨٥٧ ٢٠ ٤ ٥٢١

نزیکبکەوە بۆ نزیکترین سەد

٢١ ١٥٥ ٢٢ ٥ ٣٠٦

## ڕیزکردنی ژمارەکان Order Numbers

لە گەورەوە بۆ بچووک ڕیز بکە.

٢٣ ٦٨١، ١٦٨، ٦١٨

٢٤ ٨ ٠٩٣، ٩ ٨٠٣، ٩ ٣٨٠

لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزبکە.

٢٥ ٥١٩، ٥٢٠، ٥١١

٢٦ ٦ ٧٤٠، ٧ ١٠٠، ٦ ٤٩٩

وانەی ١

# بەهای خانەیی
## Place Value

**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٥٥ − ٢١  ٢ ٢٢ + ٤٦
٣ ٧٧ − ٢٠  ٤ ١٦٣ + ٣٦
٥ ٣٢١ + ٢٧٠

**لەبیرت بێ**
دە ڕەنووسمان هەیە:
٠، ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩
ڕەنووسەکان بەکاردەهێنین بۆ نووسینی ژمارەکان.

**بیریکەوە:**
هەر ڕەنووسێك لە بەهای ئەو خانەیە بدە کە ڕەنووسەکەی تیا دەردەکەوێت، بۆ ئەوەی ئەم بەهایەت دەست بکەوێت کە دەینوێنی.

### فێربە

قولترین شوێن لە ژێر ڕووی دەریا لە زەریایی (ئوقیانوس)ی ئارام (هێمن) دایە و دەگاتە ١١٠٣٤ مەتر. ڕەنووسی ١ لەم ژمارەیە دووجار دیارکەوتووە.

ئایا بەهای ڕنووسی ١ لە کۆتایی ژمارەکەدا چەندە؟

| دەهەزاران | هەزاران | سەدان | دەیان | یەکان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١ | ٠ | ٣ | ٤ |
| ١٠ ٠٠٠ × ١ | ١٠٠٠ × ١ | ١٠٠ × ٠ | ١٠ × ٣ | ١ × ٤ |
| ١٠٠٠٠ | ١٠٠٠ | ٠ | ٣٠ | ٤ |

بەم شێوەیە بەهای ڕەنووسی ١ لە کۆتایی ژمارەکە دەکاتە ١٠ ٠٠٠.

**لەبیرت نەچێ** بەهای ڕەنووسێك لە ژمارەیەکدا خانەی ئەو ڕەنووسە لە ژمارەکە دیاری دەکات.

بەهای ژمارەکە هەمووی دەگۆڕێت ئەگەر هەر ڕەنووسێکی لێ بگۆڕێت.



▲ قولترین شوێنی ئاوی کە ئەستێرەی دەریایی بە زیندووی تیا دۆزرایەوە دەگاتە ٧ ٥٨٤ مەتر

**نموونە** **کاتێك دەگۆڕێت:**

- أ ٥٨ ٩٣٧ بۆ ٥٩ ٩٣٧، ١٠٠٠ زیاد دەبێت
- ب ٥٨ ٩٣٧ بۆ ٦٨ ٩٣٧، ١٠ ٠٠٠ زیاد دەبێت
- ج ٥٨ ٩٣٧ بۆ ٨٨ ٩٣٧، ٣٠ ٠٠٠ زیاد دەبێت
- د ٥٨ ٩٣٧ بۆ ٥٧ ٩٣٧، ١ ٠٠٠ کەم دەبێت
- هـ ٥٨ ٩٣٧ بۆ ٤٨ ٩٣٧، ١٠ ٠٠٠ کەم دەبێت
- و ٥٨ ٩٣٧ بۆ ٣٨ ٩٣٧، ٢٠ ٠٠٠ کەم دەبێت

کام ڕەنووس پێویستە بگۆڕێت لە ژمارەی ١٣ ٨٧٢ بۆ ئەوەی ژمارەی ١٩ ٨٧٢ دەست بکەوێت؟
چۆن لەو کاتەدا بەهای ژمارە ١٣ ٨٧٢ دەگۆڕێت؟

## ◄ ساغبکەوە




١ بەهای ڕەنووسی ٦ لە ژمارەی ٧٦ ٣٠٨ چەندە؟

**بەهایٚ ڕەنووسی ٤ لە هەر یەك لەم ژمارانەدا بنووسە.**

٢ ٢٧ ٣٤٥ ٣ ٧٤ ٩٠٠

٤ ٨٣ ٤١٢ ٥ ١٤ ٨٧٣

**بەراورد لە نێوان ڕەنووسەکان بکە بۆ ئەوەی بەهای ڕەنووسە گۆڕاوەکە بدۆزیتەوە.**

٦ ٨ ٩٤٧ بۆ ٣ ٩٤٧ ٧ ٨٢ ٧٥٦ بۆ ٨٢ ٧١٦ ٨ ١٤ ٥٨٣ بۆ ١٦ ٥٨٣

## ◄ ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**بەهای ڕەنووسی ٨ لە هەر یەك لەم ژمارانەدا بنووسە.**

٩ ٥٣ ٤٨٩ ١٠ ٩٧ ٨٠٧ ١١ ٨٦ ٢٣٩ ١٢ ٦٨ ٣٩١

**بەراورد لە نێوان ڕەنووسەکان بکە بۆ ئەوەی بەهای ڕەنووسە گۆڕاوکە بدۆزیتەوە.**

١٣ ٦٢ ٨٩٥ بۆ ٣٢ ٨٩٥ ١٤ ٩٣ ٨١٤ بۆ ٩٩ ٨١٤ ١٥ ٣٨ ٠٤٧ بۆ ٣٨ ٠٩٧

**ژمارە نوێیەکە بنووسە.**

١٦ ٥ ٦٧١ کاتێك ٢ ٠٠٠ زیاد دەکرێت

١٧ ٣٧ ٨٤٢ کاتێك ١٠ ٠٠٠ کەم دەکرێت

١٨ ٣٦ ١٧٢ کاتێك ٦٠٠ زیاد دەکرێت

١٩ ٥٢ ٤٩٦ کاتێك ٧٠ کەم دەکرێت

**تەواو بکە.**

٢٠ ٢٠ ٠٠٠ + ■ + ١٠٠ + ٨٠ = ٢٤ ١٨٠

٢١ ٥٠٠٠ + ٢٠٠ + ٣٠ + ٦ = ٥٢ ■ ٦

٢٢ **تێگەیشتنی ژمارەکان** لە ژمارەیەکی ٤ ڕەنووسی. ڕەنووسی ٢ دەکەوێتە ئەو دوو خانەیەی کە گەورەترین بەهای هەبێت سەرجەرمی ڕەنووسی دەیان و ڕەنووسی یەکان دەکاتە ١٤ دەبێ ئەمە کامە ژمارە بێت؟

٢٣ **بنووسە** کام ژمارەت دەست دەکەوێت ئەگەر بۆ ژمارە ٢ ٧٩٤ ڕەنووسێك بۆ خانەی دە هەزاران زیاد بکەیت و ببێتە دوو ئەوەندەی ڕەنووسی خانەی یەکان؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

ژمارەی نادیار بنووسە لە هەردوو ڕاهێنانی ٢٤ و ٢٥

٢٤ ٦٠ − ■ = ٢٠ ٢٥ ■ − ٥ = ٣٩

٢٦ شێوەی ڕووتەختێکی ٤ لا یەکسان لە درێژیدا بڵێ.

٢٧ ٧٨ + ٦٣ کۆ بکەرەوە.

٢٨ ژمارەی نادیار لەم شێوازەدا کامەیە؟

٣١٨ ؛ ٣٢٤ ؛ ٣٣٠ ؛ ■ ؛ ٣٤٢

أ ٣٣٤ ب ٣٣٦ ج ٣٣٨ د ٣٤٠

# سەد هەزاران
# Hundred Thousands

**پێداچوونەوەی خێرا**

بەهای خانەی ڕەنووسی ٣ بنووسە

١ ٤٩ ٠٣١  ٢ ٦٩٣

٣ ٣٥ ٤٧٧  ٤ ٨٣ ٩٠٤

٥ ٢ ٣٨٦

**زاراوەکان**

دابڕین Period

## فێربە

**لە زەوییەوە بۆ مانگ** نزیکترین دووری نێوان زەوی و مانگ دەکاتە ٣٦٣ ٣٧٧ کیلۆمەتر.

بۆ نواندنی ئەم ژمارەیە ستوونێکی تایبەت زیاد دەکەین بە سەدهەزاران بۆ خشتەی خانەکان.

دابڕین

| هەزاران | | | یەکەکان | | |
|---|---|---|---|---|---|
| سەد هەزاران | دە هەزاران | هەزاران | سەدان | دەیان | یەکان |
| ٣ | ٦ | ٣ | ٣ | ٧ | ٧ |

هەر کۆمەڵێك لە سێ خانە پێك هاتبێت پێی دەوترێت **دابڕین** .ماوەیەکی زۆر کورت هەیە لەنێوان دابڕینێك و دابڕینێکی تر کە لێکیان جیا دەکاتەوە. ژمارە ٣٦٣ ٣٧٧ لە دوو دابڕین پێك هاتووە. دابڕینی یەکەکان و دابڕینی هەزارن.

**لەبیرت نەچێ** بەهای خانەیی و ناوی دابڕینەکان یارمەتیت دەدەن لە خوێندنەوە و نووسینی ژمارەکان.

شێوەی ڕەنووسی : ٣٦٣ ٣٧٧

شێوەی پیتی : سێ سەد و شەست وسێ هەزار و سێ سەد و حەفتا و حەفت

شێوەی درێژی : ٧ + ٧٠ + ٣٠٠ + ٣ ٠٠٠ + ٦٠ ٠٠٠ + ٣٠٠ ٠٠٠



**نموونە**

| شێوەی ڕەنووسی | شێوەی پیتی | شێوەی درێژی |
|---|---|---|
| أ ٤٠ ٩١٥ | چل هەزار و نۆسەد و پانزە | ٥ + ١٠ + ٩٠٠ + ٤٠ ٠٠٠ |
| ب ٦٠٧ ٣٠٤ | شەش سەد و حەفت هەزار و سێ سەد و چوار. | ٤ + ٣٠٠ + ٧ ٠٠٠ + ٦٠٠ ٠٠٠ |



## ساغبکەوە

**١** تێکرای دووری نێوان زەوی و مانگ ٣٨٤ ٤٨٢ کیلۆمەترە.
بەهای خانەیی ڕەنووسی ٣ لەو ژمارەیەدا چەندە؟

**دوو شێوەی تر بۆ هەر ژمارەیەك بنووسە.**

**٢** دووسەد و پێنج هەزار و سێ سەد و شەست و یەك.

**٣** ٩١٦ ٣٥٩

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

▲ بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٦٩ز مرۆڤ پێ ی لەسەر ڕووی مانگ دانا.

**دوو شێوەکەی تر بۆ هەریەك لەم ژمارانە بنووسە.**

**٤** سێ سەد هەزار و شەست و نۆ

**٥** ١٤٠ ٧٠٥

**٦** چوارسەد و شازدە هەزار و دووسەد و دە

**٧** ٦٠ ٠٠٠ + ٣ ٠٠٠ + ٤٠ + ٨

**تەواو بکە.**

**٨** ٥٢ ٣٧٦ = پەنجاو دوو ___؟___ سێ سەد و
___؟___ = ■ + ٣٠٠ + ٧٠ + ■ + ٥٠ ٠٠٠

**٩** نەوەد هەزار = ٩٠ ٥٨٠ = ٩٠ ٠٠٠ + ■ + ٨٠
و پێنج ___؟___ و هەشتا

**بەهای ڕەنووسە شینەکە بنووسە.**

**١٠** ٥٣٤ ٩٠٨

**١١** ٩٨٠ ٥٧١

**١٢** ١٤٣ ٢٩٦

**١٣** ٢٧٨ ١٠٥

**١٤** ئەگەر سێ هەزار زیاد بکەیت بۆ ژمارە پێنج سەد هەزار و بیست و شەش، شێوەی ڕەنووسی ژمارە نوێیەکە چۆن دەبێت؟

**١٥** من ژمارەیەکم ٩٠٠ زیاترم لە گەورەترین ژمارەی ٤ ڕەنووسی، کە دەتوانرێت پێکبهێنرێت بەبەکارهێنانی ڕەنووسەکانی ١ ، ٤ ، ٢ ، ٥، من کام ژمارەمە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**١٦** ١٩٤ = ■ − ٣٢٥

**١٧** ٨٩٦ = ٧٥ − ■

**١٨** ٦١٥ بۆ نزیکترین سەد نزیك بکەوە.

**١٩** ٣٥ + ٦٦ = ■ + ٣٥

**٢٠** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) سەرجەم بدۆزەوە.

١٢٣ + ٨٩ + ٤١٧

أ ٥١٩ ب ٥٢٩ ج ٦١٩ د ٦٢٩

# ملیۆنان
## Millions

**پێداچوونەوەی خێرا**

بەهای ڕەنووسی ٤ چەندە؟

1. ٥٤ ١٩٠
2. ٣ ٤٢٧
3. ٢٤٣ ٠١٨
4. ٨ ٩٣٤
5. ٦٤٨

**زاراوەکان**

ملیۆن Million

### فێربە

**ئایا دەزانیت؟** ڕۆژنامەکان هەواڵەکانی ناوخۆیی و نیشتمانی و جیهانیمان بۆ دابین دەکەن. یەکەم ڕۆژنامە لە ئەڵمانیا لە سەدەی پازدەهەم دا دەرچوو.

لەم ڕۆژنامەدا هەواڵێك بڵاو کرابووەوە کە پێکهاتبوو نزیکەی لە ٢٠٠ ووشە، ئەگەر لە هەر لاپەڕەیەك ٥ هەواڵ هەمان ژمارەی وشەکانی تێدا بێت. ژمارەی ووشەکان لەم لاپەڕەیەدا چەندە؟



بیر بکەوە:
٢٠٠ + ٢٠٠ + ٢٠٠ + ٢٠٠ + ٢٠٠ = ١ ٠٠٠

بەم شێوەیە هەر لاپەڕەیەك نزیکەی ١ ٠٠٠ ووشەی تێدایە.

ئەگەر لاپەڕەیەك هەزار ووشەی تێدابێت ئەوا:

١٠ لاپەڕە ١٠ ٠٠٠ ووشەی تێدایە.
١٠٠ لاپەڕە ١٠٠ ٠٠٠ ووشەی تێدایە.
١ ٠٠٠ لاپەڕە ١ ٠٠٠ ٠٠٠ ووشەی تێدایە.

**ملیۆن** بریتیە لە هەزار هەزار.

دابڕینێکی‌نوێ بۆ خشتەی خانەکان زیاد دەکەین ئەویش دابڕینی ملیونانە:

دابڕین

| ملیۆنان | | | هەزاران | | | یەکەکان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەدان | دەیان | یەکان | سەدان | دەیان | یەکان | سەدان | دەیان | یەکان |
| | | ١ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |

دەنووسین : ١ ٠٠٠ ٠٠٠ دەخوێنینەوە: ملیۆن

ملیۆن ژمارەیەکی گەورەیە. ئەگەر لە هەر خولەکێك ١٠٠ ووشە بخوێنیتەوە ئەوا پێویستت بە نزیکەی ٧ ڕۆژ هەیە بۆ ئەوەی بەبەردەوامی یەك ملیۆن ووشە بخوێنیتەوە.



## ژمارەکان بە ملیۆن More About Millions

لەو ژمارە ورد بەرەوە کە لە خشتەی خانەکان نووسراوە.

دابڕین

| ملیۆنان | | | هەزاران | | | یەکەکان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەدان | دەیان | یەکان | سەدان | دەیان | یەکان | سەدان | دەیان | یەکان |
| | ٨ | ٢ | ٩ | ٧ | ٩ | ٨ | ٦ | ٨ |

**شێوەی ڕەنووسی :** ٨٢ ٩٧٩ ٨٦٨

**شێوەی پیتی :** هەشتاو دوو ملیۆن و نۆ سەد و حەفتاو نۆ هەزار و هەشت سەد و شەست و هەشت.

**شێوەی درێژی :** ٨ + ٦٠ + ٨٠٠ + ٩ ٠٠٠ + ٧٠ ٠٠٠ + ٩٠٠ ٠٠٠ + ٢ ٠٠٠ ٠٠٠ + ٨٠ ٠٠٠ ٠٠٠

### نموونە

| شێوەی ڕەنووسی | شێوەی پیتی | شێوەی درێژی |
|---|---|---|
| أ ٥٤ ٠٦٠ ٩٠٠ | پەنجا و چوار ملیۆن و شەست هەزار و نۆسەد | ٩٠٠ + ٦٠ ٠٠٠ + ٤ ٠٠٠ ٠٠٠ + ٥٠ ٠٠٠ ٠٠٠ |
| ب ١٠٠ ٢٠٧ ٠٥٤ | سەد ملیۆن و دووسەد و حەفت هەزار و پەنجا و چوار | ٤ + ٥٠ + ٧ ٠٠٠ + ٢٠٠ ٠٠٠ + ١٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ |

### ساغبکەوە

١ چەند دابڕین بەکاردێت لە ژمارەیەکی ٨ ڕەنووسیدا؟

بەهای ڕەنووسی شین بنووسە.

٢ ٧ ٩٤٣ ١٢٠ ٣ ٨ ٤٥٠ ٢٠٣ ٤ ٦٨ ٤٥٩ ٢٢٧

شێوەی پیتی بۆ هەریەکە لەم ژمارانە بنووسە.

٥ ٥٧ ٦٤٣ ١٢٠ ٦ ١٦ ٤٥٢ ٠٠٣ ٧ ٦٠٨ ٠٤٩ ٢٢٧

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**خشتەی خانەکان بەکاربهێنە بۆدۆزینەوەی ژمارەی نادیار لە هەریەك لەم شێوازانەی خوارەوە.**

٨ ‏٦ ٧٥٨ ٣٢٤ ؛ ٦ ٧٦٨ ٣٢٤ ؛ ___؟___ ؛ ٦ ٧٨٨ ٣٢٤

٩ ‏٩ ٥٣٧ ٤٦١ ؛ ٩ ٥٣٧ ٥٦١ ؛ ___؟___ ؛ ٩ ٥٣٧ ٧٦١

١٠ شێوەی پیتی ئەم ژمارەیە بنووسە کە
١٠ ٠٠٠ ٠٠٠ زیاترە لە ٥ ٦٧٠ ٨٩١ .

١١ ژمارەی ١٢ ٠٩٧ ٣٤١ بە شێوەی درێژی بنووسە.

١٢ شێوەی پیتی بۆ ئەم ژمارەیە بنووسە.
٦ + ٥٠ + ٩٠٠ + ٣ ٠٠٠ + ٧٠ ٠٠٠ + ١٠٠ ٠٠٠ + ٨ ٠٠٠ ٠٠٠

**تەواو بکە.**

١٣ ‏٤٦ ▢ ٧ ٥٢٣ = ٦ + ٤٠ + ٨٠٠ + ٣ ٠٠٠ + ٢٠ ٠٠٠ + ٥٠٠ ٠٠٠ + ٧ ٠٠٠ ٠٠٠

١٤ ‏٧ ٩٠٣ ٢٦٤ = حەفت ___؟___ و نۆسەد و سێ ___؟___ دووسەد و شەست و چوار.

١٥ **پرسیار چییە؟** سامان ژمارەی ٤٦ ١٥٢ ٧٨٠
نووسی. وەڵام بریتییە ٦ ٠٠٠ ٠٠٠، پرسیار چییە؟

١٦ **پرسیارێك بنووسە** بە پشت بەستن بە ووتارێك لە رۆژنامەیەکدا کە ژمارەکان تیادا لەسەر شێوەی ڕەنووسی یان پیتی دەردەکەوێت.

١٧ **هەڵە لەکوێدایە؟** ئازاد لە ڕاپۆرتەکەیدا نووسی کە هەسارەی زوحەل خولێك بە دەوری خۆردا بە دە ملیۆن و حەفت سەد و شەست ڕۆژ تەواو دەکات. هەڵەکەی ئازاد دەربخە و ژمارەکە بەشێوەی ڕاست بنووسە.



▲ هەسارەی زوحەل هەر ١٠ ٧٦٠ ڕۆژ جارێك بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە .

١٨ هەسارەی زوحەل بە ئەڵقەکانی جیادەکرێتەوە. نزیکترین ئەڵقە لە هەسارەکە دەکەوێتە دووری نزیکەی ٧ ٠٠٠ کم. دورترینیان دەکەوێتە دووری نزیکەی ٧٣ ٩٩٠ کم. ئەو دووژمارەیە بەشێوەی پیتی بنووسە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**ئەنجامی ڕاهێنانی ١٩ تا ٢٢ بدۆزەوە.**

١٩ ٧١٤ + ٨٣٦  ٢٠ ١٣٨ - ٨٥٤

٢١ ٤ × ٨  ٢٢ ٧ ÷ ٤٢

٢٣ دوو ژمارە سەرجەمیان ١٥ یە و جیاوازیان ٣ یە، ئەو دوو ژمارە کامەن؟

٢٤ خانەی ڕەنووسی ٦ لە ژمارەی ٣٦ ٢٨٩ چییە؟

٢٥ ژمارەی دووسەد هەزار و هەشتا و شەش بە شێوەی ڕەنووسی بنووسە.

٢٦ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە لە پەرتووکخانەی ئارام ٨٧ پەرتووك هەیە و ١٣ پەرتووکی زیاترە لە پەرتووکەکانی پەرتووکخانەی گۆران. ئایا چەند پەرتووك هەیە لە پەرتووکخانەی گۆران؟

أ ٧١  ب ٧٤  ج ٩٥  د ١٠٠

٢٧ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە ڕێسای شێوازەکە کامەیە؟

١، ٧، ١٣، ١٩، ٢٥ ؟

أ ٦ زیاد دەکەین  ج ٥ زیاد دەکەین

ب ٤ زیاد دەکەین  د ٣ زیاد دەکەین

## شیکارکردنی پرسیارەکان

# گۆشەی ڕووناکبیران

## Thinker's Corner

### ڕەنووسەکانی ڕۆمانی Roman numerals

لە سیستەمی ئەژمێرکردنمان ڕەنووسەکانی هیندی عەرەبی خۆرهەلات ( ٠، ١، ٢، ...) بەکاردەهێنین. بەلام ئەوروپییەکان و خۆرئاواییەکان ڕەنووسەکانی (0، 1، 2، ...) بەکاردەهێنن. ڕۆمانیە کۆنەکان پیتی زمانەوانی وەك هێما بۆ ژمارەکان بەکارهێناوە.

| M | D | C | L | X | V | I |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٠٠٠ | ٥٠٠ | ١٠٠ | ٥٠ | ١٠ | ٥ | ١ |



بیر لەم دوو نموونەیە بکەوە:

٦٣ = LXIII

شرۆڤە: ١ + ١ + ١ + ١٠ + ٥٠ = ٦٣

١٤ = XIV

شرۆڤە: IV بریتییە لە ٥ - ١ ؛ ٤ + ١٠ = ١٤

کاتێك هێماکان دووبارە دەبنەوە وە کۆیان دەکەینەوە یان کاتێك برەکەی زیاد دەکات لە ڕاستەوە بۆ چەپ. هێماکان لە سێ جار زیاتر دووبارە نابنەوە.

کاتێك بەهای هێما کەمتر بێت لە بەهای ئەو هێمایەی کە لە پێشەوەی لای ڕاست دێت لێدەردەکەین.

**ئەم ژمارانەی خوارەوە بنووسە.**

١ LVI  ٢ XIX  ٣ XXXIX  ٤ XC  ٥ XLI

٦ ژمارەکانی ٣٥ و ٤٤ و ٦٢ بە ڕەنووسی ڕۆمانی بنووسە.

وانەی ٤

# بەراوردکردنی ژمارەکان

# Comparing Numbers

**پێداچوونەوەی خێرا**

بەهای ڕەنووسی شین چەندە؟

١ ١٩ ٥٦٣  ٢ ٦٨ ٣٢٠

٣ ٢٣٤ ٥٧٨  ٤ ٤٧٩ ٨٠٠




## فێربە

**ڕێڕەوی ڕووبار** درێژی ڕووباری دیجلە ١ ٧١٨کم، وە درێژی ڕووباری فورات ٢ ٩٠٠کم،

کام لەم دوو ڕووبارە درێژترە؟

**ڕێگای یەکەم** هێڵی ژمارەکان بەکاردەهێنین بۆ بەراوردکردن لە نێوان ژمارەکان. بەراورد لە نێوان دوو ژمارەی ١ ٧١٨ و ٢ ٩٠٠ دەکەین.




١ ٧١٨ دەکەوێتە لای چەپی ٢ ٩٠٠

١ ٧١٨ کەواتە بچوکترە لە ٢ ٩٠٠ واتە

٢ ٩٠٠ > ١ ٧١٨

٢ ٩٠٠ گەورەترە لە ١ ٧١٨

واتە ٢ ٩٠٠ < ١ ٧١٨

لە ئەنجامدا دەردەکەوێت کە ڕووباری فورات درێژترە لە ڕووباری دیجلە.

**ڕێگای دووەم** دەتوانین بەهای خانەیی ڕەنووسەکان بەکاربهێنین بۆ بەراورد کردن.

بیر لە دوو ژمارەی ٣٧ ٧٠٠ ٨٣٦ و ٣٧ ٣١٧ ٦٠٠ بکەوە.

**هەنگاوی ١**

لە خانەی یەکەمی لای چەپ دەستپێبکە و بەراورد لە نێوان دە ملیۆنان بکە.

٣٧ ٧٠٠ ٨٣٦

٣ = ٣ ↓

٣٧ ٣١٧ ٦٠٠

لەوێدا هەمان ژمارە هەیە بۆ دە ملیۆنان.

**هەنگاوی ٢**

بەراورد لە نێوان ملیۆنان بکە.

٣٧ ٧٠٠ ٨٣٦

٧ = ٧ ↓

٣٧ ٣١٧ ٦٠٠

لەوێدا هەمان ژمارە هەیە بۆ ملیۆنان.

**هەنگاوی ٣**

بەراورد لە نێوان سەد هەزاران بکە.

٣٧ ٧٠٠ ٨٣٦

٣ < ٧ ↓

٣٧ ٣١٧ ٦٠٠

حەوت سەد هەزار گەورەترە لە سێ سەد هەزار. کەواتە

٣٧ ٣١٧ ٦٠٠ < ٣٧ ٧٠٠ ٨٣٦

**لەبیر مەکە** بۆ ئەوەی بەراورد لە نێوان ژمارەکان بکەین، هێڵی ژمارەکان یان بەهای خانەکان بەکار دەهێنین.

## ساغبکەوە

١ شرۆڤە بکە چۆن بەراورد لە نێوان ٣ ٢١٨ و ٣ ٢٢٥ دەکەیت بە بەکارهێنانی هێڵی ژمارەکان.




ژمارە گەورەترەکە بنووسە.

٢ ٢ ٣٤٦ یان ٢ ٣٣٨

٣ ٥٢ ٤٥٧ یان ٦٧ ٦٢٣

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

ژمارە بچووکەکە بنووسە.

٤ ٤ ٥١٦ یان ٤ ١٥٦

٥ ١٨ ٩٢٧ یان ١٨ ٩٣٧

بەراورد بکە. $<$ یان $>$ یان $=$ لە شوێنی ● دابنێ.

٦ ٢ ٤٧٥ ● ٢ ٤٧٥

٧ ١٣ ٠٥٦ ● ١٣ ١٥٦

٨ ٥ ٠٠٠ ٣٧١ ● ٥٠٠ ٣٧١

٩ ٨٢ ٢٤٥ ٢٣٥ ● ٨٢ ٢٤٥ ٥٣٥

هەموو ئەو ڕەنووسانە بنووسە کە دەکرێت شوێنی ■ بگرێتەوە.

١٠ ٩٥٧ ٥٤٩ $>$ ٩■٧ ٥٣٦

١١ ٤٢٣ ٦٩٥ ٨١٥ $<$ ٤٢٣ ■٩٦ ٥١٧

ئەم خشتەیە بەکاربهێنە بۆشیکاری ڕاهێنانی ١٢ تا ١٥.

١٢ کام ڕووبار درێژترە، ئەمەزۆن یان نیل؟

١٣ کام ڕووبار لە ئاسیا لە ٢ ٧٥٠ کم درێژترە؟

١٤ کام لەم ڕووبارانەی لە خشتەکەدا هەیە درێژترینیانە؟ و کامیان کورتترینیانە؟

١٥ **پرسیارێك بنووسە** لەبارەی بەراوردکردن لە نێوان دوو ڕووبار لەو ڕووبارانەی کە لە خشتەکەدا هاتووە.

ڕووبارەکان لە جیهاندا

| ڕووبار | کیشوەر | درێژی (کم) |
|---|---|---|
| ئەمەزۆن | ئەمریکا | ٦ ٤٣٦ |
| تشانغ | ئاسیا | ٦ ٣٧٨ |
| دجلە | ئاسیا | ١ ٦٥٠ |
| فورات | ئاسیا | ٢ ٧٨٠ |
| نیل | ئەفریقیا | ٦ ٦٩٣ |

### پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

بەهای ڕەنووسی ٤ لە هەردوو ڕاهێنانی ١٦ و ١٧ بنووسە.

١٦ ٢٤١ ٣٨٩

١٧ ٧٥٩ ٤٨٦

١٨ ئەو ژمارەیە بنووسە کە ١ ٠٠٠ ٠٠٠ زیاترە لە ٩٩ ٠٣٦ ٨٧١.

١٩ ١ ٠٣٤ ٥٠٦ بنووسە بە شێوەی پیتی.

٢٠ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) شێوەی ڕەنووسی ئەم ژمارە کامەیە؟
٥٠ ٠٠٠ ٠٠٠ + ٣٠ ٠٠٠ + ٤

أ ١٥ ٣٠٤ ٠٠٠    ج ٥٠ ٠٣٠ ٠٠٤

ب ١٥ ٠٣٤ ٠٠٠    د ٥٠ ٣٠٠ ٤٠٠

# ڕیزکردنی ژمارەکان

## Order Numbers

**پێداچوونەوەی خێرا**

بەراورد بکە. < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

1. ١٧ ٠٩٤ ● ١٠ ٧٤٩
2. ٢٣ ٥١٦ ● ٣٢ ٦٥١
3. ٧ ٨٩٢ ● ٧ ٨٩٢
4. ٩ ٥١٣ ● ١٥ ٣٩٠
5. ٨٦ ٤١٣ ● ٨٤ ٣١٦

### فێربە

**ڕووبەرە لێك نزیکەکان** خشتەکە ڕووبەری پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆك و کەرکوك ڕوون دەکاتەوە بە کیلۆمەتر چوارگۆشە. ناوی پارێزگاکان بەپێی ڕووبەر لە گەورەوە بۆ بچووك ریز بکە.

**ڕێگای یەکەم** هێڵی ژمارەکان بەکاردهێنین بۆ ریزکردنی ژمارەکان .




| پارێزگا | ڕووبەر |
|---|---|
| سلێمانی | ١٧ ٠٢٣ |
| دهۆك | ٦ ٥٥٣ |
| هەولێر | ١٤ ٤٧١ |
| کەرکوك | ١٠ ٢٨٢ |

بەم شێوەیەدەبینین پارێزگای سلێمانی ئەو پارێزگایەیە کە ڕووبەرەکەی گەورەترە و پارێزگای دهۆك ڕووبەرەکەی بچووکترە. ڕیزکردنەکە بەم شێوەیە دەبێت سلێمانی، هەولێر، کەرکوك، دهۆك

**ڕێگای دووەم** بەهای خانەیی بەکاردەهێنین بۆ ریزکردنی ژمارەکان. ٤٣٧ ٢٤٣ ، ٤٦٩ ٨٧٢ ، ٤٣٥ ٦٨١ لە بچووکەوە بۆگەورە ریزبکە.

**هەنگاوی ١**

بەراورد بکە لە نێوان ڕەنووسەکان لە خانەی سەد هەزاران :

٤٣٧٢٤٣
↓
٤٦٩٨٧٢
↓
٤٣٥٦٨١

ڕەنووسەکانی سەد هەزاران هەمان ڕەنووسن.

**هەنگاوی ٢**

بەراورد لە نێوان ڕەنووسەکانی خانەی دە هەزاران بکە :

٤٣٧٢٤٣
↓
٤٦٩٨٧٢
↓
٤٣٥٦٨١

ڕەنووسی ٦ گەورەترە لە ٣. کەواتە ٤٦٩ ٨٧٢ ژمارە گەورەکەیە.

**هەنگاوی ٣**

بەراورد لە نێوان ڕەنووسەکانی خانەی هەزاران بکە :

٤٣٧٢٤٣
↓
٤٣٥٦٨١

٥ بچووکترە لە ٧. کەواتە ڕیزکردنەکە لە بچووکەوە بۆ گەورە بریتییە لە : ٤٣٥ ٦٨١؛ ٤٦٩ ٨٧٢؛ ٤٣٧ ٢٤٣

**لەبیرت نەچێ** دەتوانین ژمارەکان ریز بکەین لە بچووکەوە بۆ گەورە یان لە گەورەوە بۆبچووك.

### ساغبکەوە

1. کاتێك بەراورد لە نێوان دوو ژمارەدا دەکەیت کە هەمان ژمارەیان لە ڕەنووسەکان تێدابێت لە، بۆچی بە یەکەم خانە دەست پێ دەکەیت لەلای چەپەوە؟ باسی بکە.
2. لە بچووکتر بو گەورە ریز بکە : ٣٥ ٠٠٠ ؛ ٣٥ ٢٢٥ ؛ ٣٤ ٣٥٠ .

**ژمارەکان ریز بکە لە بچووکەوە بۆ گەورە بەبەکارهێنانی هێڵی ژمارەکان**

٣ ٣٦ ٣٩٧ ؛ ٣٦ ٤٥٧ ؛ ٣٦ ٣٨٤ ؛ ٣٦ ٤١٩




٤ ١٩٠ ٢٠٩ ؛ ١٩١ ٢١٠ ؛ ١٩٠ ٢٠١

٥ ژمارەکانی ناو لیستەکە لە گەورەوە بۆبچووک ریز بکە پاشان هێڵێک بکێشە بەژێر ئەو ژمارانەی کە دەکەوێتە نێوان ٦٢٥ ٠٠٠، ٦٥٠ ٠٠٠.

| | | |
|---|---|---|
| ٦٤٨ ٧٢٩ | ٦٢٨ ٣٤١ | ٦٤٢ ٩٧٨ |
| ٦٨٢ ٤٣٧ | ٦٢٤ ٨٧٩ | ٦١٢ ٤٤٣ |

**ئەو ژمارەیە بنووسە کە بەرامبەر هەر پیتێکە. پاشان گەورەترین و بچووکترین ژمارە بنووسە.**

٦




٧




**هەموو ئەو ڕەنووسانە دیار بکە کە لە توانا دایە لە شوێنی ■ دابنرێت.**

٨ ١ ٢٠٠ > ١ ■٢٠ > ١ ٠١٢

٩ ٨٣ ٠٩٦ > ٨■٠٨٦ > ٨٢ ٩١٣

١٠ من ژمارەیەکم لە نێوان ١٤٩ ٩٠٠ و ١٥٠٠٠٠ ڕەنووسی دەیانم ٧ گەورەترە لە ڕەنووسی یەکانم، سەرجەمی هەردوو ڕەنووسەکە ٩ یە. من کام ژمارەم؟

**خشتە بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێانی ١١ تا ١٣.**

١١ ناوی پارێزگاکان ریز بکە بەپێی ڕووبەرەکانیان لە گەورەوە بۆ بچووک ( ڕووبەرەکان بە کیلۆمەتر چوارگۆشە).

١٢ کام پارێزگا ڕووبەرەکەی گەورەترە لە ڕووبەری پارێزگای بەسرە؟

١٣ کام پارێزگا ڕووبەرەکەی کەمترە لە ٥ ٠٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشە؟

| پارێزگا | ڕووبەر | پارێزگا | ڕووبەر |
|---|---|---|---|
| بەغدا | ٧٣٤ | بەسرە | ١٩ ٠٧٠ |
| موسل | ٣٧ ٣٢٣ | هەولێر | ١٤ ٤٧١ |
| سلێمانی | ١٧ ٠٢٣ | دیالە | ١٧٦٨٥ |
| کەربەلا | ٥ ٠٣٤ | | |

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

ئەنجامی ڕاهێنانی ١٤ و ١٥ بدۆزەوە.

١٤ ٥٧١ + ٣٩٨

١٥ ٧٠٠ − ١٠٣

١٦ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — بەهای ڕەنووسی ٥ چەندە لە ٥٤ ٢٧٨؟

أ ٥

ب ٥٠

ج ٥ ٠٠٠

د ٥٠ ٠٠٠

# نزیککردنەوەی ژمارەکان

# Rounding Numbers

**پێداچوونەوەی خێرا**

کامیان نزیکترە لە ژمارەی ١٠٠ یان ٢٠٠؟

١ ٩٨ ‏ ‏ ٢ ١٧٢

٣ ١٤٥ ‏ ‏ ٤ ١٥٩

٥ ١٢٠

**زاراوەکان**

نزیککردن Round

## فێربە

**ڕووبەری بەرفراوان** ڕووبەری عێراق ٤٣٨ ٣١٧ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، ڕۆژنامە نوسێك ویستی نزیکی بکاتەوە بۆنزیکترین دە هەزار دەبێ کام ژمارە بنوسێت؟




**ڕێگای یەکەم** هێڵی ژمارەکان بەکاردەهێنین.




بیریکەوە : ٤٣٨ ٣١٧ نزیکترە لە ٠٠٠ ٤٤٠.

بەم شێوەیە، ئەگەر ژمارەی ٤٣٥٠٥٢ نزیك بکەینەوە بۆنزیکترین دە هەزار، ئەوا دەبێتە ٠٠٠ ٤٤٠.

**ڕێگای دووەم** سەیری ڕەنووسەکە دەکەین لە خانەی نزیککردنەوە. ژمارە ٤٣٨٣١٧ بۆ نزیکترین دە هەزار نزیك بکەوە.

- ئەو ڕەنووسە دیار بکە لەو خانەی کە بۆی نزیك دەکرێتەوە.
- سەیری ڕەنووسی هاوسێی لای ڕاست بکە.
- ئەگەر ڕەنووسی هاوسێکەی کەمتر بوو لە ٥ ئەوا ڕەنووسی خانە نزیککراوەکە ناگۆڕێت.
  بەڵام ئەگەر ٥ بوو یان گەورەتر لە ٥ ، ١زیاد بکە بۆ ڕەنووسی خانە نزیککراوەکە.

- ڕەنووسەکانی لای ڕاستی خانەی نزیك بوونەوە هەموو دەبێتە سفر.
- ڕەنووسی خانەی دە هەزاران بریتییە لە ٣.
- ڕەنووسی هاوسێی لای ڕاستی بریتییە لە ٨ .
- ٨ > ٥
  ١ زیاد دەکەین: ٣+١=٤
- ژمارە نزیك کراوەکە بریتییە لە ٠٠٠ ٤٤٠ .

**نموونە شوێنەوار** لە کوردستان زۆر شوێنەواری دێرین هەیە لەوانە وەك ئەشکەوتی هەزار مێرد و شانەدەر. ئەشکەوتی هەزار مێرد دەکەوێتە دووری ١٣ کم باشوری ڕۆژ ئاوای شاری سلێمانی لە شاخی بەرانان. لەلایەن شوێنەوار ناسانی ئەمریکی پشکێنراوە لە ساڵی ١٩٢٨ ز، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ٠٠٠ ٥٠ ساڵ بۆ قۆناغی چاخی بەردین.

- ٠٠٠ ٥٠ نزیکترین نزیککراوەیە بۆ خانەی دە هەزاران. بۆ کام لەم دوو ژمارەیە؟ ٩٩٩ ٤٤ یان ١١١ ٤٥.

## وولاتی عیراق

ئەندامە لە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، عیراق زۆر نەتەوەی تێدا دەژی هەر نەتەوەیەك بە ئازادی زمانی دایك قسە ( ئاخافتن) دەکات. کورد یەکێکە لەو نەتەوانەی کە هەزاران ساڵە لەسەر زەوی باوباپیری دەژی لە کوردستان، ئێستا لە سایەی حکومەتی هەرێمی کوردستان کاروباری خۆی بەرێوە دەبات. خشتەی بەرامبەر ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان لە چاو دانیشتوانی عیراق لە ساڵی ١٩٤٧ز تا ساڵی ١٩٨٧ز روون دەکاتەوە.

- ژمارەی دانیشتوانی ساڵی ١٩٤٧ز نزیکبکەوە بۆنزیکترین سەد هەزار.
- ژمارەی دانیشتوانی ساڵی ١٩٧٧ز نزیکبکەوە بۆ نزیکترن دە هەزار.

ژمارەی دانیشتوانی کورد لە کوردستانی عیراق لە چاو دانیشتوانی عیراق

| ساڵ | ژمارەی دانیشتوان |
|---|---|
| ١٩٤٧ | ١ ٣٤٧ ٣٧١ |
| ١٩٥٧ | ١ ٧٢٢ ٥٦٤ |
| ١٩٦٥ | ٢ ١١٨ ٢٨٨ |
| ١٩٧٧ | ٣ ٠٦٩ ٤١١ |
| ١٩٨٧ | ٤ ٠٩٦ ١١٥ |

## چەند نموونەیەکی تر



١٧ ٣٣٩ ٠٠٠ نزیکبکەوە بۆنزیکترین ملیۆن

١٧ ٣٣٩ ٠٠٠ دەکەوێتە نێوان ١٧ ٠٠٠ ٠٠٠ و ١٨ ٠٠٠ ٠٠٠.

سەیری ڕەنووسی سەدانی هەزار بکە

خانەی نزیککردنەوە

١٧ ٣٣٩ ٠٠٠

ڕەنووسی ٣ بچووکترە لە ٥. کەواتە ڕەنووسی ٧ وەك خۆی دەمێنێتەوە بەبێ گۆڕان. بەم شێوەیە، ئەوە نزیککردنەوەی ١٧ ٣٣٩ ٠٠٠ بۆ نزیکرتین ملیۆن بریتیە لە ١٧ ٠٠٠ ٠٠٠.

١ ٣٠٩ ٠٠٠ نزیکبکەوە بۆنزیکترین دە هەزار

١ ٣٠٩ ٠٠٠ دەکەوێتە نێوان ١ ٣٠٠ ٠٠٠ و ١ ٣١٠ ٠٠٠.

سەیری ڕەنووسی هەزاران بکە

خانەی نزیککردنەوە

١ ٣٠٩ ٠٠٠

ڕەنووسی ٩ گەورەترە لە ٥. کەواتە ١ زیاد بکە بۆڕەنووسی ٠، بەم شێوەیە ئەوا نزیککردنەوی ١ ٣٠٩ ٠٠٠ بۆنزیکترین دە هەزار بریتییە لە ١ ٣١٠ ٠٠٠ .

## ساغبکەوە

١ باسبکە چۆن ٩٩ ٩٩٩ نزیکدەکەیتەوە بۆ نزیکترین دە هەزار.

نزیکبکەوە بۆ نزیکترین هەزار.

٢ ١٦ ٨٢٢ ٣ ٨٩٥ ٠١٤ ٤ ٤ ٢٨٦ ٥٣١

نزیکبکەوە بۆ بەهای خانەیی ڕەنووسە شینەکە.

٥ ٩٨ ٧٤٩ ٦ ١٦٧ ٤٠٣ ٧ ٣١٧ ٤٨٢

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

نزیکبکەوە بۆ نزیکترین دە هەزار.

٨ ٢٧١ ٥١٦ ٩ ٣٨ ٩٠٠ ١٠ ١٠٢ ٠٠٠

نزیکبکەوە بۆ نزیکترین سەد هەزار.

١١ ٦٢٤ ٢٥٩ ١٢ ١ ٤٧٢ ٩٠٠ ١٣ ٧ ٩٠٠ ٦١٠

نزیکبکەوە بۆ نزیکترین ملیۆن.

١٤ ٢ ١٥٠ ٠٠٠ ١٥ ١٧ ٨٣١ ٨٩٩ ١٦ ٣١٦ ٥٠٠ ٠١٢

نزیکبکەوە بۆ بەهای خانەیی ڕەنووسە شینەکە.

١٧ ٧ ١١١ ١٥٧ ١٨ ٢ ٨٣٧ ٤٨٦ ١٩ ٣٧٥ ٩٢٦

٢٠ کام لەم دوو ژمارەیە ٣٨١ ٨٦٤ ١٦ و ٢٦٨ ٨٤٩ ١٦ دەتوانرێت نزیك بکرێتەوە بۆشازدە ملیۆن و هەشت سەد هەزار.

٢١ لەسەر خشتەی خانەکان دابڕینی هەزارانم ٧٤ . وە دابڕینی یەکانم ٣ + ٢٠ + ٥٠٠، ڕەنووسی ملیۆنانم سێ ئەوەندەی ڕەنووسی یەکانە. من کام ژمارەم؟

**ژینگە** دارستان لەعێراق بەگشتی وە لە کوردستان بە تایبەتی سامانێکی نەتەوەییە پاراستنی ئەرکێکی نیشتمانییە.

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەی بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانەکانی ٢٢ تا ٢٥.

| ڕووبەری دارستانەکان بە دۆنم | |
|---|---|
| پارێزگا | ڕووبەر (دۆنم) |
| هەولێر | ٢ ٣١٢ ٠٠٠ |
| سلێمانی | ٢ ١٩٥ ٢٤١ |
| دهۆك | ٢ ٠٥٧ ٦٠٤ |
| موسل | ٥١٤ ٤٦٠ |

٢٢ لەکام پارێزگا ڕووبەری دارستان تیایدا کەمترە لە ملیۆن؟

٢٣ لەکام ژمارە لە خشتەکەدا ژماری ٥ دەکەوێتە خانەی دە هەزاران؟

٢٤ ئەو ژمارەی بەرامبەر پارێزگای سلێمانیە نزیك بکەوە بۆ نزیکترین سەد هەزار.

٢٥ ئەو ژمارەی بەرامبەر پارێزگای هەولێرە نزیکترە بۆ ٠٠٠ ٣٠٠ ٢ یان ٠٠٠ ٤٠٠ ٢.

٢٦ بنووسە چۆن ٦٨٥ ٩٩٤ نزیك دەكەیتەوە بۆ نزیكترین سەد هەزار. شرۆڤە بكە.

٢٧ ٩٨ ٤٥٦ نزیك بكەوە لە نزیكترین سەد، پاشان ئەو ژمارەی بەدەست هاتووە بۆ نزیكترین هەزار، پاشان دوا ژمارە نزیك بكەوە بۆ نزیكترین دە هەزار.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیكردنەوە

٢٨ ژمارە هەژدە هەزار و پێنج سەد و حەفتا بە شێوەی ڕەنووسی بنووسە.

٢٩ ئەو ژمارەیە چییە كە ١٠٠ ی زیاترە لە سەرجەمی دوو ژمارەی ٤١٨ و ٩٧٥؟

٣٠ كامیان گەورەترە ٤١٣ ٥٦٨ یان ١٤٣ ٥٦٨؟

٣١ ژمارەی ٢١٠ ١٥٠ بە شێوەی پیتی و پاشان بە شێوەی درێژی بنووسە.

٣٢ ئەو ژمارەیە چەندە كە لە ٨٠٠ ی دەربكەی جیاوازییەكەی گەورەترە لە ٢٠٠؟

أ ٤٢٣  ب ٦٠٩  ج ٦١٢  د ٧٤٢

٣٣ ئەو ژمارەیە كامەیە كە دەكەوێتە نێوان ٨٩١ ٤٧٦ و ١٩٨ ٦٧٤

أ ٩٨١ ٤٦٨  ب ٩١٨ ٦٤٧  ج ٨١٩ ٦٧٦  د ١٨٩ ٧٤٦

## شیكاركردنی پرسیارەكان — دەروازەیەك لەسەر زمان

## Link Up to Language

### بەراورد و جیاوازی Compare and Contrast



كاتێك بەراورد لە نێوان دوو شت یان زیاتر دەكەیت، تۆ سەیری خاڵە هاوشێوەكان دەكەیت لە نێوان ئەم شتانەدا و دەریان دەخەیت، وە كاتێك جیاوازی لە نێوان دوو شت یان زیاتر دیار دەخەیت، ئەوا تۆ سەیری خاڵەجیاوازەكانیان دەكەیت.

بیر لە لیستی زانیارییەكان بكەوە بۆهەندێ لە بیابانە گەورەكانی جیهان، دەتوانی بەراورد و جیاوازی لە نێوان ئەم بیابانانەدا بكەیت.

| بیابان | شوێن | ڕووبەر (كم چوارگۆشە) |
|---|---|---|
| گەورە | ئەفریقیا | ٩ ٠٠٠ ٠٠٠ |
| ئوستralیا | ئوستralیا | ٣ ٨٠٠ ٠٠٠ |
| ڕوبعی خالی | ئاسیا | ١ ٣٠٠ ٠٠٠ |
| غوبی | ئاسیا | ١ ٠٣٦ ٠٠٠ |
| كالاهاری | ئەفریقیا | ٥٢٠ ٠٠٠ |

| بەراورد compare | جیاوازی contrast |
|---|---|
| بیابانی گەورە و كەلەهاری دەكەونە كیشوەری ئەفریقیا | بیابانی ئوستralیا تاكە بیابانە لە كیشوەری ئوستralیا |
| ڕووبەری هەریەكە لەو بیابانانەی لە لیستەكەدا هاتووە گەورەترە لە ٥٠٠ ٠٠٠ كیلۆمەتر چوارگۆشە (دووجا). | ڕووبەری بیابانی گەورە لە سەرجەمی ڕووبەری هەر چوار بیابانەكانی تر گەورەترە |

٣٤ بیر لە ڕووبەری بیابانی عەرەبی و بیابانی گەورە بكەوە, چۆن بەراورد و جیاوازی لە نێوانیان دەكەیت؟

٣٥ هەر ژمارەیەك لە ژمارەكانی لیستەكە نزیك بكەرەوە بۆ نزیكترین ملیۆن، چی تێبینی دەكەیت؟

وانەی ٧

# ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان
## خشتەیەك پێكبهێنە
## Problem Solving Strategy
### Make a Table

**پێداچوونەوەی خێرا**

ژمارە گەورەترەکە بڵێ.

١ ٤ ٨٦١ یان ٤ ٨١٠

٢ ١٧ ٠٩١ یان ٧ ٩٢٠

٣ ٥ ٦١٤ یان ٥١ ٤٦٢

٤ ٣٢ ٨١١ یان ٣٧ ١١٢

٥ ٣٠٠ ٠٢٠ یان ٣٠ ٢٠٠

**پرسیارێك** چیای طور لە سینا ٢ ٦٣٧ مەتر بەرزە لە ئاستی ڕووی دەریا. چیای سەوز لە عومان ٢ ٩٨٠ مەتر، چیای زەفیر لە سعوودیە ٢ ٣٦٨ مەتر و چیای مەکمل لە لوبنان ٣ ٠٨٧ مەتر.
کام دوو چیا لەو چوارە بەرزاییەکانیان نزیکترە لە لووتکەی هەڵگورد لە چیای حەساروٚست لە کوردستانی عیراق کە بەرزیەکەی ٣ ٦٠٧ مەتر.

**تێبگە Understand**

- داواکراو چییە؟
- ئەو زانیارییانەی بەکاری دێنیت چییە؟
- ئایا زانیاری تر هەیە کە بەکارت نەهێنابێت؟ چییە؟

**پلاندانێ Plan**

- کام ڕێگا بەکاردەهێنی بۆ شیکاری پرسیارەکە؟

دەتوانی زانیارییەکان ڕێکبخەی لە خشتەدا.

**شیکار بکە Solve**

- چۆن سوود لەم ڕێگایە وەردەگریت بۆ شیکاری پرسیارەکە؟

بەراورد لە نێوان بەرزاییەکان بکە. لە خشتەکە لە بەرزترین تا نزمترین بنووسە. بەرزایی چیای مەکمل و چیای سەوز نزیکە لە بەرزایی چیای حەساروٚست .

| چیا | شوێن | بەرزایی |
|---|---|---|
| حەساروٚست | کوردستان | ٣ ٦٠٧ |
| مەکمل | لوبنان | ٣ ٠٨٧ |
| سەوز | لوبنان | ٢ ٩٨٠ |
| طور | لوبنان | ٢ ٦٣٧ |
| زەفیر | لوبنان | ٢ ٣٦٨ |



**ساغبکەوە Check**

- چۆن دڵنیا دەبیت لە ڕاستی وەڵامەکەت؟

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

١ خشتەیەکی نوێتر پێکبهێنە لەسەر خشتەکەی پێشووە چیای پیرەمەگرونی بۆ زیادبکە کە بەرزییەکەی نزیکەی ٢٨١٤ مەترە لە کوردستانی عێراق، ڕیزیان بکە لە کەمترین بەرزی تا زۆرترین بەرزی.

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** **خشتەیەك دروست بکە بۆ شیکاری پرسیارەکان لە ٢ تا ٥.**

**نووسەرێك چوار کتێبی بیانی لەسەر سەرکەوتن بە سەر چیاکاندا دانا. «سەربکەوە تا بژی» ٣٩٠ ٤٥٧ دانەی لێ فرۆشرا و، «سەرکەوتنی ئارام» ٧٤٩ ٢٥٦ دانە و .«شۆڕبوونەوە بە چالاکی» ٢١٦ ٣٥٤ دانە، بەڵام کتێبی «میلەکان لە ڕۆژێکدا» ٧٥٢ ٣٩١ دانەی لێ فرۆشرا.**

٢ کام کتێب زیاتری لێ فرۆشراوە؟

٣ کام کتێب کەمترینی لێ فرۆشراوە؟

٤ کام کتێب فرۆشتنەکەی نزیکە لە فرۆشتنی پەرتووکی «میلەکان لە ڕۆژێکدا»؟

أ شۆڕبوونەوە بە چالاکی

ب سەربکەوە تا بژی

ج میلەکان لە ڕۆژێکدا

د سەرکەوتنی ئارام

٥ کام کتێب لە کتێبی «سەرکەوتنی ئارام» بە نزیکەی سەد هەزار دانەی زیاترە؟

هـ شۆڕبوونەوە بە چالاکی

و سەربکەوە تا بژی

ز سەرکەوتنی ئارام

ح میلەکان لە ڕۆژێکدا

### ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان

- وێنەی هێڵکاریەك یان وێنەیەك بکێشە
- نموونەیەك دروست بکە یان کردارێك جێ بەجێ بکە
- لیستێکی ڕێك پێکبهێنە
- بەدوای شێوازدا بگەڕێ
- **خشتەیەك یان وێنەیەکی ڕوون کردنەوەی پێکبهێنە**
- بخەملێنە و ساغ بکەوە
- بە هەنگاوەکانتا بگەڕێوە
- پرسیارێکی ئاسان شیکار بکە
- هاوکێشەیەك بنووسە
- دەرئەنجامی ژیربێژی بەکاربهێنە

### ڕاهێنان لەسەر چەند ڕێگایەکی جیاواز

٦ یەکێك لە کۆمپانیاکان دوو ساڵ جارێك پیشەنگایەك دەکاتەوە. پێشەنگای بیست و شەشەمینی لە ساڵی ١٩٤٨ز کردەوە. لە کام ساڵدا پیشەنگای پەنجاهەمینی کردەوە؟

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** **خشتە بەکاربهێنە بۆ شیکارکردنی ڕاهێنانەکان لە ٧ تا ٩.**

پلانی ئالان بۆ ڕاهێنان

| ڕۆژ | ژمارەی بەرزبوونەوە |
|---|---|
| دووشەممە | ٦ |
| سێ شەممە | ٨ |
| چوارشەممە | ١٠ |
| پێنج شەممە | ١٢ |

٧ ئەگەر ئالان لەسەر ئەو شێوازە بەردەوام بێت، ئایا ڕۆژی یەکشەممە چەندجار خۆی بەرز دەکاتەوە؟

٨ ئالان ٨٤ جار کرداری خۆ بەرزکردنەوە لەم هەفتەدا ئەنجام دەدات. چەند بەرزبوونەوەی ئەنجامداوە لە ڕۆژانی هەینی و شەمە و یەکشەممە؟

٩ ئالان چەند جار بەرزبوونەوە ئەنجام دەدات لە ٧ ڕۆژدا، ئەگەر ڕۆژی ٨ بەرزبوونەوە ئەنجام بدات؟ وە ئەگەر ١٠ جار بەرزبوونەوە ئەنجام بدات؟

١٠ **پرسیار چییە؟** ئاشنا ٨ وێنەی هەیە، ڕۆشنا ٥ وێنەی زیاترە لە ئاشنا. لەیلا ٤ ی کەمترە لە ڕۆشنا. وەڵام بریتیە لە ٩.

# پێداچوونەوە
# Review

## دڵنیا بوون لە زاراوەکان و چەمکەکان Check Vocabulary and Concepts

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

| |
|---|
| ملیۆن Million |
| گەورەترە لە Greater than |
| بچووکترە لە Less than |
| نزیککراوەی Round |
| ٥ یان گەورەتربێ 5 or more |
| بچووکتربێ لە ٥ Less than 5 |

١ ـــ؟ـــ بریتییە لە هەزار هەزار.

٢ ٨ ٠٠٠ ٠٠٠ بریتییە لە ـــ؟ـــ ی ژمارە ٧ ٩٥٠ ٦١٤ بۆ نزیکترین ملیۆن.

٣ کاتێك ژمارەیەك نزیك دەکەینەوە، ١ زیاد دەکەین بۆڕەنووسی خانەی نزیك بوونەوە، ئەگەر هاتوو ڕەنووسی لای ڕاستی ـــ؟ـــ بێت.

٤ ٦ ٨٠٩ ١١١ ـــ؟ـــ ٩ ٨٠٩ ٠٩٩

## دڵنیا بوون لە کارامەییەکان Check Skills

هەر ژمارەیەك لەسەر دوو شێوەکەی تر بنووسە.

٥ ٢٠ ٠٠٠ + ٨٠ + ٣

٦ ٤ ٩٠٢ ٧٤٦

بەهای ڕەنووسە شینەکە بنووسە.

٧ ٨ ٤٥١

٨ ٢٩ ٧١٠

بەراورد بکە. < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

٩ ٣٤ ٩٨٠ ● ٣ ٦٩٠

١٠ ٧٨٠ ٢٥٦ ● ٧٨٣ ١٣٠

نزیك بکەوە بۆ بەهای خانەیی ڕەنووسە شینەکە.

١١ ١٠٥ ٢١٩

١٢ ٤ ٥٩١ ٢٠٣

١٣ ژمارەکان ڕیز بکە لە بچووکەوە بۆ گەورە
٢٥ ٩٧٢ ؛ ٢٥ ٦١٦ ؛ ٢٥ ٩٠٨

١٤ ژمارەکان ڕیز بکە لە گەورەوە بۆ بچووك
٣ ٠٩٠ ٩١٠ ؛ ٣ ٧٥٩ ٢٠٤ ؛ ٣ ٧٩١ ٨٠٨

## دڵنیا بوون لە شیکاری پرسیارەکان Check Problem Solving

١٥ ژمارەی دانیشتوان لە شاری أ دەگاتە ٣٤٢ ٦٥٣، وە لە شاری ب دەگاتە ٣٢١ ٤٥١، وە لەشاری ج دەگاتە ٣٠٨ ٣٥٣ وە لەشاری د دەگاتە ٠٦٠ ٣٥٣. ئەم شارانە لە خشتەیەکدا تۆمار بکە بەپێ ی ژمارەی دانیشتوان لە بچووکترەوە بۆ گەورەتر. کام لەم شارانە ژمارەی دانیشتوانی لە ٣٥٢ ٠٠٠ کەس زیاترە؟

١٦ ڕووبەری عیراق ٤٣٨ ٣١٧ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە (دووجا). ئەگەر ئەم ژمارەیە نزیك بکەیتەوە بۆ نزیکترین سەد هەزار پاشان بۆ نزیکترین دە هەزار وە پاشان بۆ نزیکترین هەزار. کام ژمارەی نزیککراوە نزیکترە لە ڕووبەری ڕاستەقینەی؟ .

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## Standardized Test Prep

**ئاگاداربە! Tip!**

- هەموو ووردەکارییەکان بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت بۆ پرسیار.
- وەڵامەکەت ساغبکەوە.

### وەڵامی گونجاو دەوریدە لە ڕاهێنانی ١ تا ٩.

**١** شێوەی درێژی ژمارە ٩١٢ ٥٠٤ کامەیە؟

أ ٢ + ١٠ + ٩٠٠ + ٤٠ ٠٠٠ + ٥٠٠ ٠٠٠

ب ٢ + ٩٠ + ٤٠ ٠٠ + ٥٠٠ ٠٠٠

ج ٢ + ١٠ + ٩٠٠ + ٤ ٠٠٠ + ٥٠٠ ٠٠٠

د ٢ + ٩٠١٠ + ٤ ٠٠٠ + ٥٠٠ ٠٠٠

**٢** خانەی ڕەنووسی ٧ لە ١٨٩ ٧٠٤ ٣ کامەیە؟

أ هەزاران ‌ ج دەهەزاران

ب سەدهەزاران ‌ د ملیۆنان

**٣** شێوەی ڕەنووسی بۆ ژمارە هەشت ملیۆن و دووسەد و سی هەزار و پەنجاو شەش کامەیە؟

أ ٠٥٦ ٢٠٣ ٨ ‌ ج ٣٥٦ ٢٠٠ ٨

ب ٠٥٦ ٨٢٣ ‌ د ٠٥٦ ٢٣٠ ٨

**٤** ئەو ژمارەیە کامەیە کە گەورەترە لە ٥٧٠ وە ڕەنووسی دەیانی بریتییە لە ٣؟

أ ٥٣٠ ‌ ب ٦٠٣ ‌ ج ٦٣٠ ‌ د ٧٠٣

**٥** ڕەنووسی خانەی ملیۆنان لە ١٤٩ ٨٢٠ ٦ کامەیە؟

أ ٢ ‌ ب ٠ ‌ ج ٦ ‌ د ٨

**٦** کام لەم ڕستانە ڕاستە؟

أ ٣٥ ٧١٦>٣٦ ١٧٦ ‌ ج ٣٦ ١٧٦>٣٦ ٦٧١

ب ٣٦ ٦٧١<٣٦ ٧١٦ ‌ د ٣٦ ١٦٧>٣٦ ١٧٦

**٧** ■ = ١٩٧ − ٥٨٣

أ ٣٨٦ ‌ ج ٤١٤

ب ٤٨٦ ‌ د جگە لەمە

**٨** کام لەم ژمارانە لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزکراوە؟

أ ١٥ ٦٠٧؛ ١٥ ٦٥٢؛ ١٦ ٤٨٧

ب ١٥ ٦٠٧؛ ١٦ ٤٨٧؛ ١٥ ٦٥٢

ج ١٥ ٦٥٢؛ ١٦ ٤٨٧؛ ١٥ ٦٠٧

د ١٦ ٤٨٧؛ ١٥ ٦٥٢؛ ١٥ ٦٠٧

**٩** نزیککراوەی ژمارە ١١٢ ٦٠٩ ٤ بۆ نزیکترین ملیۆن کامەیە؟

أ ٤ ٦٠٠ ٠٠٠ ‌ ج ٤ ٠٠٠ ٠٠٠

ب ٤ ٦٠٩ ٠٠٠ ‌ د ٥ ٠٠٠ ٠٠٠

### Write What You Know ئەوەی دەیزانی بینووسە

**١٠** ژمارەیەك پێکهاتووە لە ٤ ڕەنووسی هەموویان لە یەکتر جیانە، بچووکترین ڕەنووسیان ١ و سەرجەمیان ١١. بچووکترین ژمارە کامەیە کە ئەم مەرجانەی تیادا دێتە دی؟
گەورەترین ژمارە کامەیە کە ئەم مەرجانەی تیادا دێتە جێ؟

بەشی ٢

# کۆکردنەوە و لێدەرکردنی ژمارە گەورەکان

# Add and Subtract Greater Numbers



مێرووەکان بەشێك پێکدەهێنن لە کۆمەڵەی گیاندارە جومگەدارەکان. جومگەدارەکان مێرووەکان و پولەکەدارەکان و جاڵجاڵۆکەییەکان دەگرێتەوە.
جاڵجاڵۆکەییەکان جیاوازن لەگەڵ مێرووەکاندا، مێرووەکان شەش قاچیان هەیە بەڵام جاڵجاڵۆکەییەکان ٨ قاچیان هەیە.
شیکاری پرسیارەکان خشتەکە بەکاربهێنە بۆ ئەوەی بدۆزیتەوە ژمارەی جۆری مێرووەکان چەند زیاترە لە ژمارەی جۆری جاڵجاڵۆکەییەکان.

| لە پولەکەدارەکان ٤٠ ٠٠٠ جۆر | لە مێرووەکان ٧٥٠ ٠٠٠ جۆر | جاڵجاڵۆکەییەکان ٧٠ ٠٠٠ جۆر |
|---|---|---|
| قرژانگ | کوللە « کولی» | جالجالۆکە «داپیرۆچکە» |
| قرژاڵ | مێرووله | دووپشك |
| ڕۆبیان | مێش | قاچ درێژەکان |
| کوللەی دەریا | پەپوولە « پلاتینگ» | مۆرانە |
|  | قالۆچە | گەنە |

# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know

ئەم لاپەڕەیە بەکاربهێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی زانیارییەکانی داواکراو لەم بەشەدا

سەرجەم Sum
جیاوازی Difference
کۆبکەوە Add
لێدەربکە Subtract
ئاڵوگۆڕ لە کۆکردنەوە
order property of addition
پێکەوەبەستن لە کۆکردنەوە
Grauping propert of addition

## زاراوەکان Vocabulary

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

١ لە ڕستەی کۆکردنەوە ٢٤ + ٣١ = ٥٥، ژمارە ٥٥ بریتییە لە ___؟___ .

٢ لە ڕستەی لێدەرکردن ٧٤ − ٣١ = ٤٣، ژمارە ٤٣ بریتییە لە ___؟___ .

٣ لە نموونەکانی ___؟___ ٣ + ٥ = ٥ + ٣

## ڕستە کراوەکان Open Sentences

ژمارەی نادیار بنووسە.

٤ ■ + ٤ = ١٢     ٥ ٦ + ■ = ١٤     ٦ ٧ + ■ = ١٦

## کۆکردنەوە و لێدەرکردنی ژمارەی دوو ڕەنووسی Two Digit Addition and Subtraction

کۆبکەوە یان لێدەربکە.

٧ ٢٤ / ٦٨+     ٨ ٣٦ / ١٤−

٩ ٢٣ + ٣٧ + ٤٢ = ■     ١٠ ٨٧ − ٥٩ = ■

## کۆکردنەوە و لێدەرکردنی ژمارەی سێ ڕەنووسی Three Digit Addition and Subtraction

کۆبکە یان لێدەربکە.

١١ ٤٨٠ / ٥٢٠+     ١٢ ٨٥١ / ٢١٦−     ١٣ ٦٥٧ / ١٩٨−

١٤ ٨٧٠ − ٣٥٧ = ■     ١٥ ٩٠٠ − ٢٣٧ = ■     ١٦ ٧٩٤ + ٥١٨ = ■

## کۆکردنەوەی ستوونی Column Addition

کۆبکەوە.

١٧ ١٣ / ٢٧ / ١٣+     ١٨ ٣٣ / ١٧ / ٤٦ / ٢٤+     ١٩ ٦٦ / ٤٤ / ٦٦ / ٤٤+

وانەی ١

# خەمڵاندنی سەرجەم و جیاوازی

## Estimate Sum and Difference

**پێداچوونەوەی خێرا**

بۆ گەورەترین بەهای خانەیی نزیک بکەوە.

١ ٤٦٠  ٢ ٧٤٢

٣ ٩٢٧  ٤ ٣٨١

٥ ٥٧٠

### فێربە

**بەرنامەی پەسەندکراو** خشتەکە ئەنجامی ڕاپرسی لەسەر بەرنامەی تەلەفزیۆنی پەسەندکراو لە لایەن خەڵکی هەرێمی کوردستان ڕوون دەکاتەوە. سەرجەمی بینەرانی بەرنامەکانی کۆمەڵایەتی و زانستی و پەروەردەیی لا پەسەندە نزیکەی چەندە؟



| بەرنامە پەسەندکراوەکان | |
|---|---|
| وەرزش | ٣٩ ٣٤١ |
| ڕامیاری | ٨ ٤٢٢ |
| پەروەردەیی | ٤٢ ٩٦٣ |
| زانستی | ٢ ٤٨٩ |
| کۆمەڵایەتی | ٦ ٨١٢ |

**بخەملێنە** ٤٢ ٩٦٣ + ٢ ٤٨٩ + ٦ ٨١٢

هەر ژمارەیەك بۆ نزیکترین هەزار **نزیك بکەوە** پاشان کۆ بکەوە.

$$\begin{array}{r} ٤٢\,٩٦٣ \\ ٢\,٤٨٩ \\ +\ ٦\,٨١٢ \\ \hline \end{array} \qquad \begin{array}{r} ٤٣\,٠٠٠ \\ ٢\,٠٠٠ \\ +\ ٧\,٠٠٠ \\ \hline ٥٢\,٠٠٠ \end{array}$$

کەواتە لێرەدا نزیکەی ٥٢ ٠٠٠ کەس بەرنامەکانی کۆمەڵایەتی یان زانستی یان پەروەردەیی پەسەند دەکەن.

هەروەها دەتوانین نزیککردنەوە بەکار بهێنین بۆخەمڵاندنی جیاوازی.

ژمارەی ئەوانەی بەرنامەی پەروەردەیی یان لا پەسەندە نزیکەی چەند زیاترە لەوانەی کە بەرنامەکانی وەرزشییان لا پەسەندە؟



$$\begin{array}{r} ٤٢\,٩٦٣ \\ -\ ٣٩\,٣١٤ \\ \hline \end{array} \qquad \begin{array}{r} ٤٣\,٠٠٠ \\ -\ ٣٩\,٠٠٠ \\ \hline ٤\,٠٠٠ \end{array}$$

کەواتە ژمارەی ئەوانەی بەرنامەی پەروەردەیی یان لا پەسەندە نزیکەی ٤ ٠٠٠ کەسیان زیاترە لە ژمارەی ئەوانەی بەرنامەی وەرزشیان لا پەسەندە.

### ساغبکەوە

١ **شرۆڤە بکە** چۆن سەرجەمی دوو ژمارەی ٤ ٨٧٢ و ٣٦ ١٣٢ دەخەملێنی؟

سەرجەم یان جیاوازی بخەملێنە.

٢ 
٦ ٨٥٢
٤ ٢٥٧-

٣ 
٣٧١ ٩٣٦
٤٢٧ ٤١٧+

٤ 
١٣ ٠٤٢
٥٨ ٤١٧+

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

سەرجەم یان جیاوازی بخەملێنە.

٥ 
٢ ٩٠٨
٨ ٦٠٠+

٦ 
٣٨ ٠٣٧
٤ ٠٤٧-

٧ 
٩ ٥٨٤
٨ ١٠٢+

ڕەنووسی نادیار بنووسە تا بگونجێت لەگەڵ وەڵامی خەملێنراو.

٨ 
٢ ١٤٦
■١٤٤+
٦ ٠٠٠

٩ 
■٠٤ ١٢٥
٦١٠ ٧١٣-
٢٠٠ ٠٠٠

١٠ 
٩٢ ٤٢٠
■٨ ١٢١-
٤٠ ٠٠٠

بەکارهێنانی پێدراوەکان خشتەکە بەکاربهێنە بۆ شیکارکردنی پرسیارەکانی ١١ و ١٢.

١١ ژمارەی ئامێرە فرۆشراوەکانی پێوانە ٢٥ ئینج «گرێ» و ٢٩ ئینج نزیکەی دەکاتە چەند؟

١٢ جیاوازی نێوان گەورەترین ژمارە و بچووکترین ژمارە لە ئامێرە فرۆشراوەکان نزیکەی چەندە ؟

ئامێری تەلەفزیۆنی فرۆشراو

| پێوانە | ژمارەی ئامێرە فرۆشراوەکان |
|---|---|
| ٢٩ ئینج | ٤٤ ٣٠٦ |
| ٢٥ ئینج | ٥٩ ٧١٠ |
| ٢١ ئینج | ٨٢ ٩١٨ |
| ١٧ ئینج | ٥٥ ٢٢٠ |
| ١٤ ئینج | ٣٣ ٦٠٠ |

١٣ **دەرئەنجام** دوو ژمارە بنووسە کە سەرجەمی خەملێنراویان بکاتە ١ ٠٠٠ ٠٠٠ بۆ هەر ژمارەیەك ڕەنووسەکانی ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦ بەکاربهێنە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

١٤ ئەم ژمارانە لە گەورەترینەوە بۆ بچووکترین ڕیز بکە: ٢٦ ٨١٢ ، ٨ ٦١٢ ، ٢٨ ٦٤٣

١٥ لەم شێوازەدا دوو ژمارە نادیارەکە بنووسە:
١٧ ، ■ ، ٣٧ ، ٤٧ ، ■ ، ٦٧

١٦ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە شێوەی درێژی بۆ ژمارە دووسەد و هەشتا وشەش کامەیە؟

أ ٢٠٠ + ٨٦
ب ٢٨٠ + ٦
ج ٢٠٠ + ٨٠ + ٦
د ٢٠٠٠ + ٨٠ + ٦

وانەی ٢

# ئەژمێرکردنی هزری

## Mental Math

**پێداچوونەوەی خێرا**

ئەو ژمارەیە بنووسە کە هەزاری زیاترە.

١ ١٣٥٠ ٢ ٧٨٠٢

٣ ١٥٩١٧ ٤ ٢٣٦١٨

٥ ٤٢٦٧٨

### فێربە

**بیربکەوە و ئەژمێر بکە** لە هەندێ کاتدا پێویستت بە کاغەز و پێنووس نابێت بۆ ئەژمێر کردن. دەتوانی یەکێك لەم ڕێگایانە بەکاربهێنیت.




### ڕێگای یەکەم

دەتوانی بە هزر دەیان پاشان یەکان کۆ بکەیتەوە.

### نموونە

**أ** ٥٨ + ٢٦ بدۆزەوە — بیربکەوە: ٥٨ = ٥٠ + ٨ ، ٢٦ = ٢٠ + ٦

| | |
|---|---|
| دەیان کۆبکەوە | ٧٠ = ٢٠ + ٥٠ |
| یەکان کۆبکەوە | ١٤ = ٦ + ٨ |
| هەردوو ئەنجام کۆبکەوە | ٨٤ = ١٤ + ٧٠ |
| کەواتە | ٨٤ = ٢٦ + ٥٨ |

**ب** ٤٦ − ٢٥ بدۆزەوە — بیربکەوە: ٤٦ = ٤٠ + ٦ ، ٢٥ = ٢٠ + ٥

| | |
|---|---|
| دەیان لێدەربکە | ٢٠ = ٢٠ − ٤٠ |
| یەکان لێدەردبکە | ١ = ٥ − ٦ |
| هەردوو ئەنجام کۆبکەوە | ٢١ = ١ + ٢٠ |
| کەواتە | ٢١ = ٢٥ − ٤٦ |

### چەند نموونەیەکی تر

**ج** ٣٩ + ٤٨ بدۆزەوە

٧٠ = ٤٠ + ٣٠

١٧ = ٨ + ٩

٨٧ = ١٧ + ٧٠

**د** ٩٧ − ٥٢ بدۆزەوە

٤٠ = ٥٠ − ٩٠

٥ = ٢ − ٧

٤٥ = ٥ + ٤٠

- شرۆڤە بکە چۆن ئەم ڕێگایە بەکاردەهێنیت بۆ ئەوەی ٢٦ + ٢٩ بدۆزیتەوە. وە هەروەها چۆن بەکاری دەهێنیت بۆ ئەوەی ٧٨ − ٣٦ بدۆزیتەوە.

## ڕێگای دووەم

دەتوانی یەکێ: لە ژمارەکان بگۆڕی بۆ چەندجارەکانی ژمارە ١٠ وە ژمارەکەی تر ڕێکبخەی بۆ ئەوەی ئەنجام نەگۆڕێت.

### نموونە

| ب ٨٦ − ٢٩ بدۆزەوە | أ ٦٧ + ٢٤ بدۆزەوە |
| --- | --- |
| ٢٩ + ١ = ٣٠ یەك دەخەیتە سەر بۆ سەر ٢٩ بۆ ئەوەی ٣٠ دەست کەوێت | ٦٧ + ٣ = ٧٠ سێ دەخەیتە سەر ٧ بۆئەوەی ٧٠ دەست بکەوێت |
| ٨٦ + ١ = ٨٧ یەك دەخەیتە سەر ٨٦ تا ئەنجامەکە نەگۆڕێت | ٢٤ − ٣ = ٢١ سێ لە ٢٤ کەم دەکەیتەوە تا ئەنجامەکە نەگۆڕێت |
| ٨٧ − ٣٠ = ٥٧ | ٧٠ + ٢١ = ٩١ |

لە نموونەی أ دەتوانی ٤ لە ٢٤ دەربکەی . پاشان چی دەکەیت بۆ ئەوەی بەهزر ئەنجامی ٦٧ + ٢٤ بدۆزیتەوە؟ کرداری لێدەرکردن ئاسان دەبێت ئەگەر هاتوو ئەو ژمارەیەی لێی دەردەکەیت چەندجارەی «دە» بێت. کاتێك کە لەسەری زیاد دەکەیت بۆ ئەوەی بیگۆڕی بۆچەندجارەکانی «دە» ئەوا پێویستە هەمان بەها بخەیتە سەر ژمارەکی تر تا ئەنجامەکە نەگۆڕێت.

## چەند نموونەیەکی تر

| د ٨٤ + ٧٦ بدۆزەوە | ج ٧٥ − ٣٨ بدۆزەوە |
| --- | --- |
| ٨٤ + ٦ = ٩٠ | ٣٨ + ٢ = ٤٠ |
| ٩٠<br>+٧٦<br>١٦٦<br>−٦<br>١٦٠ | ٧٥<br>−٤٠<br>٣٥<br>+٢<br>٣٧ |

## ساغبکەوە

١ باس بکە چۆن ٨٣ − ٣٧ بە هزر ئەژمێر دەکەیت.

٢ پرسیارێکی کۆکردنەوەبنووسە و سەرجەمەکەی بە هزر ئەژمێر بکە.

**بە هزر ئەژمێر بکە. ئەو ڕێگایە شرۆڤە بکە کە بەکاری دەهێنیت.**

٣ ٤٥ − ١٣    ٤ ٥٥ + ٢٥    ٥ ٧٨ − ٣٧    ٦ ٦٦ + ٦٧

**بە هزر ئەژمێر بکە بۆ شیکاری پرسیارەکانی ٧ تا ١٤ . ئەو ڕێگایەی بەکاری دەهێنیت شرۆڤە بکە.**

٧ ٨٥ − ١٧    ٨ ٢٨ + ٧٢    ٩ ٨٣ − ١٩    ١٠ ٩٥ + ٢٨

١١ ٦٨ + ٢٢    ١٢ ٥٢ − ٢٧    ١٣ ٧٤ + ٣٢    ١٤ ٧٦ − ٢٨

**سەرجەم یان جیاوازی بنووسە.**

١٥ ١٦٨ − ٥٩    ١٦ ٢١٦ + ٧٩    ١٧ ٤٣١ − ٢٣٢    ١٨ ٤٤١ + ٢٦٣

**ژمارەی نادیار بنووسە.**

١٩ ١٨ + ■ = ٤٨    ٢٠ ٣٧ − ■ = ١٨    ٢١ ■ − ٢٣ = ٤٢

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەی بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ شیکاکردنی پرسیارەکان لە ٢٢ تا ٢٤.

٢٢ ئەو گیاندارە کامەیە کە درێژییەکەی نزیکەی ٢٠ مەترە؟

٢٣ ئەگەر نەهەنگێکی شین چووە پاڵ دوو قرشی نەهەنگ لەسەر یەك هێڵ ئەوا درێژی هەرسێکیان دەبێتە چەند؟

٢٤ کام دوو گیاندار زۆرترین جیاوازیان هەیە لە درێژیدا؟ وە کامەیان کەمترین جیاوازی لە نێوانیان هەیە؟



## درێژی گیاندارە ئاوییەکان

| گیاندار | درێژی بە «مەتر» |
|---|---|
| نەهەنگی شین | ٣٤ |
| قرشی نەهەنگ | ١٨ |
| تیمساحی دەریایی ئاسیا | ١٠ |
| حەباری ئەتلەسی گەورە | ٦ |
| قرژاڵی جاڵجاڵۆکەیی یابان | ٣ |

٢٥ لە یەکێك لە بەخچەکانی ئاژەڵاندا ٦٧٢ جۆر گیانلەبەر هەیە. وە لە باخچەیەکی تردا ٥٩٩ جۆر هەیە؟ ژمارەی جۆرەکانی باخچەی یەکەم چەند زیاترە لە دووەم؟

٢٦ پارکی نیشتمانی لەڕۆژی هەینیدا پێشوازی لە ٢ ٩٩٩ مێوان کرد، وە لە ڕۆژی شەممە پێشوازی لە ١٤٦٥ مێوان کرد. ئەژمێرکردنی هزری بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی ژمارەی مێوانەکان لە هەردوو ڕۆژەکەدا. ڕێگاکەت شرۆڤە بکە.

٢٧ **پرسیارەکە چییە؟** خشتەکە بەکاربهێنە. وەڵام ٢٤ مەترە.

٢٨ لە پێشەنگایەکی ساڵانەی قوتابخانەکاندا، ١١ قوتابی بەشداریان کرد لە وێنە و ٩ قوتابی لە ئیش و کاری دەستی، ٦ قوتابی لە مۆسیقا. سەرجەمی قوتابیان نزیك بکەوە بۆ نزیکترین دە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

۲۹ ژمارەکان لە گەورەوە بۆ بچووك بنووسە
۱۸۹ ۸۷۵ ،۱۸۷ ٤۸۷ ،۱۸۹ ٥۷٦ ،۲ ۷٦۳، ۲ ٥٦۷

۳۰ ژمارەی ۱۳۲ ۷۸۹ ٥ بۆ نزیکترین سەد هەزار نزیکبکەوە.

**بەراورد بکە. < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ لە هەر دوو ڕاهێنانی ۳۱ و ۳۲.**

۳۱ ۸ ٥٦۷ ● ۹ ۰۸۷

۳۲ ۸ ۲۳۷ ۹٥۸ ● ۸ ٥٤۹ ۷۸۸

۳۳ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) درێژی لاکان لە سێگۆشەیەکدا چارەکە مەترێکە، ٤٠سم، ۳۷سم. چێوەی ئەم سێگۆشەیە چەندە؟

أ ۸۷ سم
ب ۲۸ م
ج ۹۲ سم
د ۱۰۲ سم

۳٤ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) ڕستە هەڵەکە کامەیە؟

أ ۸ + ۱۰ = ۱۰ + ۸
ب ۸ + ۱ = ۲ + ۷
ج ۱۲ + ۳ = ۱۱ + ٤
د ۷ + ۹ = ٦ + ۸

## شیکارکردنی پرسیارەکان

# گۆشەی ڕووناکبیران
# Thinker's Corner

**ژمارە گونجاوەکان Compatiable Numbers** کاتێ دوو ژمارە کۆ دەکەینەوە و سەرجەمیان ۱۰ یان ۱۰۰ یان وەك ئەوان بێت، ئەوا پێیان دەڵێین دوو ژمارەی گونجاو. کرداری کۆکردنەوەی هزری ئاسان دەبێت لە کاتی بوونی ژمارە گونجاوەکان. ئاڵوگۆڕ لە کۆ کردنەوەدا یارمەتیمان دەدات بۆ کۆکردنەوەی ژمارەکان هەرچۆن ڕیز کرابێت وە ئەنجامەکەش هەروەك خۆی دەمێنێتەوە. دەتوانین ئاڵوگۆڕ بەکاربهێنین بۆ دەستپێکردن بە کرداری کۆکردنەوە بە گەڕان بەدوای ژمارە گونجاوەکان.

بۆ نموونە: ٦۸ + ۲۳۰ + ۳۲ + ۱۷۰ کۆ دەکەینەوە.

٦۸ + ۲۳۰ + ۳۲ + ۱۷۰ (۱۰۰ ، ٤۰۰)

٦۸ و ۳۲ دوو ژمارەی گونجاون. هەروەها ۲۳۰ و ۱۷۰ دوو ژمارەی گونجاو.

٦۸ + ۲۳۰ + ۳۲ + ۱۷۰ = ٦۸ + ۳۲ + ۲۳۰ + ۱۷۰
= ۱۰۰ + ٤۰۰ = ٥۰۰

کەواتە وەڵام بریتییە لە ٥۰۰

چەندجووت لە ژمارە گونجاوەکان
۱۰ و ۹۰
۲۰ و ۸۰
۳۰ و ۷۰
٤۰ و ٦۰
٥۰ و ٥۰
سەرجەمی هەر جووتێك دەکاتە ۱۰۰




**ژمارە گونجاوەکان بەکاربهێنە تا سەرجەم بدۆزیتەوە.**

۱ ۱۷٥ + ۲٥ + ٦۱ + ۳۹ =

۲ ۷۸ + ۱٥۰ + ۱۲۲ + ٤۸ =

# کۆکردنەوە و لێدەرکردن

# Addition and Subtraction

**پێداچوونەوەی خێرا**

1. ٢١٨ + ٤٦٠
2. ١٤٥ – ٥٥٣
3. ٢٥٠ + ١٧٥
4. ٤٤٥ – ٧٩٦
5. ٣٥٧ + ٨٠٤

## فێربــــــــە

**لووتکەی جیهان** بەرزترین لووتکەی چیا لە جیهاندا

لووتکەی ئیڤەریستە لە ئاسیا، وە بەرزاییەکەی دەگاتە ٨ ٨٤٨ مەتر، ئەو لووتکەی کە دوای دێت بەرزاییەکەی دەگاتە ٨ ٧١١ مەترە ، سەرجەمی ئەو دوو بەرزاییە ئەژمێر بکە.



### نموونە ١

سەرجەمی ٨ ٨٤٨ + ٨ ٧١١ = ▬ ئەژمێر بکە.

بخەملێنە کە ٩ ٠٠٠ + ٩ ٠٠٠ = ١٨ ٠٠٠

**هەنگاوی ١**

یەکان کۆ بکەوە.

٨ ٨ ٤ ٨<br>
٨ ٧ ١ ١ +<br>
٩

**هەنگاوی ٢**

دەیان کۆبکەوە.

١<br>
٨ ٨ ٤ ٨<br>
٨ ٧ ١ ١ +<br>
٥ ٩

**هەنگاوی ٣**

سەدان کۆ بکەوە ١٤ سەدانت هەیە. ١٠ سەدان بگۆڕە بۆ یەك هەزار و بیخە سەر هەزاران.

١<br>
٨ ٨ ٤ ٨<br>
٨ ٧ ١ ١ +<br>
٥ ٥ ٩

**هەنگاوی ٤**

هەزاران کۆ بکەوە.

١<br>
٨ ٨ ٤ ٨<br>
٨ ٧ ١ ١ +<br>
١ ٧ ٥ ٥ ٩

کەواتە سەرجەمی هەردوو بەرزاییەکە بریتییە لە ١٧ ٥٥٩ مەترە.

سەرنج بدە ئەم وەڵامە شیاوە، چونکە نزیکە لە وەڵامی خەملێنراو.

### نموونە ٢

جیاوازی ٩ ٩١٠ – ٧ ٣٤٠ ئەژمێر بکە.

**هەنگاوی ١**

یەکان لێدەربکە.

٩ ٩ ١ ٠<br>
٧ ٣ ٤ ٠ –<br>
٠

**هەنگاوی ٢**

بۆ لێدەرکردنی دەیان سەدێك خوردبکەوە و بیگۆڕە بۆ ١٠ دەیی.

٨ ١١<br>
٩ ~~٩~~ ~~١~~ ٠<br>
٧ ٣ ٤ ٠ –<br>
٧ ٠

**هەنگاوی ٣**

سەدان لێدەربکە.

٨ ١١<br>
٩ ~~٩~~ ~~١~~ ٠<br>
٧ ٣ ٤ ٠ –<br>
٥ ٧ ٠

**هەنگاوی ٤**

هەزاران لێدەربکە.

٨ ١١<br>
٩ ~~٩~~ ~~١~~ ٠<br>
٧ ٣ ٤ ٠ –<br>
٢ ٥ ٧ ٠

کەواتە جیاوازی دەکاتە ٢ ٥٧٠ .

## ساغبکەوە

**١** شرۆڤە بکە کەی خوردکردنەوە پێویستە لەکرداری لێدەرکردن.

**ئەژمێر بکە. بخەملێنە تاکو ساغبکەیتەوە.**

**٢**
٦ ٨٩٩
٢ ٧٦٢+

**٣**
٤ ٤٧٤
١ ٤٠٦-

**٤**
٨ ٩٠٢
٥ ٧٣٠-

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**ئەژمێر بکە. بخەملێنە تاکو ساغبکەیتەوە.**

**٥**
٦ ٧٩٨
٤٢٧-

**٦**
٣ ٢٠٤
٢ ٤١٣-

**٧**
٢ ٤٠٩
٥ ٧٦٢
٤ ٥٠٠+

**٨** ١ ٩٥٢ + ٢ ٥١٨

**٩** ٤ ١٧٦ + ١ ٦٥١ + ١ ٥٢٥ + ١ ١٢٤

**١٠** ٤ ٦٥١ − ٦ ٢٣٠

**١١** ٩٣٦ + ١ ٩٨٧

**ڕەنووسی نادیار بنووسە.**

**١٢**
٢ ٩٠■
١ ٨٩٤-
١ ٠٠٧

**١٣**
٣ ٤٨٦
■٩٦٤+
٩ ٤٥٠




| ڕووبار | درێژییەکەی |
|---|---|
| خابوور | ١٦٠ کم |
| زێ ی گەورە | ٣٩٢ کم |
| زێ ی بچووک | ٤٠٠ کم |
| عوزێم | ٢٣٠ کم |
| سیروان | ٣٨٤ کم |

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** نەخشەکە بەکاربهێنە بۆشیکاری ڕاهێنانی ١٤ تا ١٦.

**١٤** سەرجەمی درێژی کام دوو ڕووبار نزیکەی ٦٠٠کم دەبێت؟

**١٥** سەرجەمی هەر سێ ڕووباری سیروان و خابور و زێ ی بچووک چەندە؟

**١٦** جیاوازی نێوان درێژترین ڕووبار و کورترین ڕووبار چەندە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

لە هەردوو ڕاهێنانی ١٧ و ١٨ نزیک بکەوە بۆ نزیکترین سەد.

**١٧** ٥٣٦

**١٨** ٧١٢

**١٩**
٥٦٢
٣٤٩+

**٢٠**
٧٣٦
٤٧٢-

**٢١** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — ژمارەی نادیار لەم شێوازە کامەیە؟

١٣٥ ؛ ١٦٠ ؛ ١٨٥ ؛ ■ ؛ ٢٣٥

أ ١٩٢
ب ١٩٧
ج ٢٠٠
د ٢١٠

## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٩٠٠ − ٦٠٠

٢ ١٠٠٠ − ٥٠٠

٣ ٢٠٠ − ٥٠

٤ ٥٠٠ − ٢٥٠

٥ ٦٠٠ − ١٧٥

وانەی ٤

# سفر لە لێدەرکردندا
# Subtract Across Zeros

### فێربە

**پاڵەوانانی ڕۆیشتنی ماوە درێژەکان** زانایان بە دوای شوێنەواری گیانداران دەکەون بۆ پشکنینی کۆچکردنیان. نەهەنگی کووڕ «الاحدب» هەر ساڵێك ١٣ ١٠٠ کم دەبڕێت لە کۆچکردیندا، لەکاتێکدا کیسەڵی دەریایی سەوز ٤ ٦٣٥کلم لە ماوەی کۆچکردنیدا لە ساڵیکدا. کۆچکردنی نەهەنگی کووڕ لەساڵێکدا چەند کیلۆمەتر زیاترە لە کۆچکردنی کیسەڵ؟

### نموونە ١

**جیاوازی ئەژمێر بکە ١٣ ١٠٠ − ٤ ٦٣٥ = ■ .**

**بخەملێنە کە ١٣ ٠٠٠ − ٥ ٠٠٠ = ٨ ٠٠٠**

**هەنگاوی ١**

**یەکان لێدەربکە**

یەك سەد خورد بکەوە بۆ ١٠ دەیی پاشان یەك ١٠ خوردبکەوە بۆ١٠ یەکی.

$$\begin{array}{r} 13\,100 \\ -\;4\,635 \\ \hline 5 \end{array}$$

**هەنگاوی ٢**

**دەیان لێدەربکە.**

$$\begin{array}{r} 13\,100 \\ -\;4\,635 \\ \hline 65 \end{array}$$

**هەنگاوی ٣**

**سەدان لێدەربکە .**

هەزارێك خوردبکەوە بۆ ١٠ سەدی

$$\begin{array}{r} 13\,100 \\ -\;4\,635 \\ \hline 465 \end{array}$$

**هەنگاوی ٤**

**هەزارن لێدەربکە.**

$$\begin{array}{r} 13\,100 \\ -\;4\,635 \\ \hline 8\,465 \end{array}$$



بەم جۆرە کۆچکردنی نەهەنگی کووڕ نزیکەی ٨ ٤٦٥ کلم ی زیاترە لە کۆچکردنی کیسەڵی دەریایی سەوز.سەرنج بدە وەڵامەکە نزیکە لە بەهای خەملێنراو ٨ ٠٠٠ کلم. بۆیە ئەمە وەڵامی شیاوە.

### ساغبکەوە

١ بۆ لێدەکردنی ٧ ١٦٥ لە ٤٠ ٠٠٠ چۆن خوردکردنەوە دەکەی. شرۆڤە بکە.

ئەژمێر بکە . بخەملێنە بۆ ئەوەی ساغبکەیتەوە.

٢ ‏ ٤٠٠ ‏ ٢٨٧−

٣ ‏ ٣ ٧٠٠ ‏ ١ ٦٨٢−

٤ ‏ ٣٠٠ ‏ ١٦٣−

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

ئەژمێر بکە . بخەملێنە بۆ ئەوەی ساغبکەیتەوە.

٥ ‏ ٤ ٠٠١ ‏ ٣ ٠٩٠−

٦ ‏ ٣ ٠٠٥ ‏ ١ ٩٧٨−

٧ ‏ ٥ ٠٠٤ ‏ ٨٥٩−

٨ ‏ ٥ ٧٠٠ ‏ ٤ ١٩٠−

بەراورد بکە. < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

٩ ‏ ٣ ٧٥٦ − ٤ ٢٠٠ ● ٢ ٥٤١ − ٣ ٠٠٠

١٠ ‏ ١ ٠٧٩ − ٢ ١٠٠ ● ١ ٠٠٨ − ٢ ٠٠٠

١١ کێشی گوێلەکەیەکی دەریا ١٣٠کگم زیاترە لە کێشی گوێلەکەیەکی تر. کێشی گوێلەکەی یەکەم چەندە ئەگەر کێشی گوێلەکەی دووەم ١٧٩کگم بێت.



١٢ باڵندەیەکی بەستەلەکی باکور ١٦ ٤٠٠کم دەفڕێت تا دەگاتە کیشوەری بەستەلەکی باشوور. بەڵام کیسەلێك ٢ ٢٥٢ کم مەلەوانی دەکات تا لێوارەکانی ئەمریکای باشوور. دووری یەکەم چەندزیاترە لە دووری دووەم؟

١٣ کێشی نێرە فیلێك لە باخچەی ئاژەڵاندا ١ ٣٩٠ کگم و کێشی مێیە فیلێك ١ ١٢٢ کگم. ئایا کێشی نێرە فیلەکە چەندی زیاترە لەکێشی مێیەکە؟

١٤ **هەڵە لەکوێیە؟** ئازاد ٩ ٩١٠ لە ٢٣ ٠٠٠ دەرکرد و ە ١٢ ٠٩٠ی بەدەست هێنا. ئازاد لەکوێ هەڵەی کرد. وەڵامی ڕاست بنووسە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

١٥ ‏ ٢ ٦٢٤ ‏ ٢ ٩٨١+

١٦ ‏ ٦ ٤٢٢ ‏ ٨ ٦٠٠+

١٧ ژمارەی چوار ملیۆن و حەفتاو شەش هەزار و سەد و سێ بە شێوەی ڕەنووسی بنووسە.

١٨ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) ئازاد پەرتووکەکانی لە سندوقیك دانا کە درێژییەکەی ٩٠سم و پانییەکەی ٥٦سم بوو، پانی سندوقەکە چەند کەمترە لەدرێژییەکەی؟

أ ١٤٦سم

ب ٦٥ سم

ج ٩٤سم

د ٣٤سم

## پێداچوونەوەی خێرا

١. ٤٤ − ٢٦٣
٢. ٤٦٣ − ٦٣٠
٣. ١٢ + ٢٨ + ٣٢
٤. ٤١ + ١٧ + ٢٣
٥. ٣٩٢ − ٨٥٤

وانەی ٥

# هەڵبژاردنی هۆکارێك

# Choose a Method

**فێربە**

**دانیشتوانی شاری سلێمانی** لە یارییەکدا سامان و ئارام دوو کارتیان ڕاکێشا کە هەریەکە ٦ ڕەنووسی تێدا نووسرابوو، ژمارەی سامان ١٣٠ ٦٣٤ بوو و ژمارەی ئارام ٤٢٤ ٢٢٨. سامان ووتی ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی نزیکە لە ژمارەکەی من. ئارام ووتی نەخێر نزیکە لە کۆی ژمارەی هەدووکمان، سەرجەمی هەردوو ژمارەکانیان چەندە؟




### نموونە

بخەمڵێنە: ٠٠٠ ٦٠٠ + ٠٠٠ ٢٠٠ = ٠٠٠ ٨٠٠

هۆکارێك هەڵبژێرە

**دەتوانی کاغەز پێنووس بەکاربهێنیت.**

| | |
|---|---|
| ٦٣٤١٣٠<br>٢٢٨٤٢٤+<br>٨٦٢٥٥٤ | کۆبکەوە، ١٢ هەزار لە شێوەی ٢ هەزاری و ١ دە هەزاری کۆبکەوە. |

**دەتوانی ژمێرەر «حاسبە» بەکاربهێنی.**

دەست پێدەکەیت بە تۆمارکردنی ڕەنووسەکان و هێماکان لە چەپەوە بۆ ڕاست.

6 3 4 1 3 0 +
2 2 8 4 2 4 = 862554

کەواتە ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی لە ساڵی ٢٠٠٧ بریتییە لە ٥٥٤ ٨٦٢ کەس.

بۆچی هەژمارکردنی هزری دوور دەخەیتەوە لە کۆکردنەوەی ئەم دوو ژمارەیە؟

جیاوازی نێوان ژمارەکەی سامان و ژمارەکەی ئارام ئەژمێر بکە .

### نموونە

بخەمڵێنە: ٠٠٠ ٦٠٠ − ٠٠٠ ٢٠٠ = ٠٠٠ ٤٠٠

هۆکارێك هەڵبژێرە

**دەتوانی ژمێرەر «حاسبە» بەکاربهێنی.**

دەست پێدەکەیت بە تۆمارکردنی ڕەنووسەکان و هێماکان لە چەپەوە بۆ ڕاست.

6 3 4 1 3 0 −
2 2 8 4 2 4 = 405706

کەواتە جیاوازی نێوان هەردوو ژمارەکەی سامان و ئارام بریتییە لە ٧٠٦ ٤٠٥.

دەتوانی کاغەز و پێنووس بەکاربهێنی.

| هەنگاوی ٣ | هەنگاوی ٢ | هەنگاوی ١ |
|---|---|---|
| هەزاران لێدەربکە. دە هەزاریەك خورد بکەوە بۆ ١٠ هەزاری. ژمارەکانی تر لێدەربکە. | سەدان لێدەربکە. هەزارێك خوردبکەوە بۆ ١٠ سەدی. | یەکان لێدەربکە. دەیەك خوردبکەوە بۆ١٠ یەکی. دەیان لێدەربکە. |
| ٦٣٤ ١٣٢<br>٢٢٨ ٤٢٤ −<br>٤٠٥ ٧٠٦ | ٦٣٤ ١٣٢<br>٢٢٨ ٤٢٤ −<br>٧٠٦ | ٦٣٤ ١٣٢<br>٢٢٨ ٤٢٤ −<br>٠٦ |

## ساغبکەوە

ئەژمێر بکە. ئەو هۆکارەی بەکاری دەهێنی بڵێ.

١) ٨٩ ٦٣٤ − ٢٦ ٥١٢

٢) ٤٣٧ ٧٠٢ + ٥٨ ٣٩٠

٣) ٥٠٠ ٦٠٠ − ٢٦٣ ٧١٠

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

ئەژمێر بکە. ئەو هۆکارەی بەکاری دەهێنی بڵێ.

٤) ٩٨٣ ٣٦٨ − ٢٦١ ١٢٥

٥) ٤١٢ ٥٣٣ + ٢٨٣ ٠٥٦

٦) ٢٠٠ ٠٠٠ + ١٣٤ ٩٠٢

بەراورد بکە. < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

٧) ٦٣٧ ١٢٤ − ٢١٦ ٢٧٥ ● ٧٨٤ ٧٢٥ − ٤٩٨ ٤١٩

٨) ٤٦٧ ٣١١ + ٢١١ ٣٤٥ ● ٢٠٠ ٤٥٧ + ٤٧٨ ١٩٩

ڕەنووسی نادیار بنووسە.

٩) ٤٣■ ٢٥٧ − ٢٥٣ ٠١٩ = ١٨٦ ٢٣٨

١٠) ٢٧٨ ٢٦٩ + ٩٢١ ٥٧■ = ١ ١٩٩ ٨٤٣

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

١١) کامەیان بچووکترە ٣١٥ ٧٣١ یان ٣٥١ ٧٣١؟

١٢) بیست پیاو لە ڕیزێکدا ریز بوون بو کرینی پلیت« پسولە». ژمارەی پیاوەکان لە نێوان پێنجەم و دوازدەهەم چەندن؟

١٣) ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — جیاوازی چەندە؟

٤٨٩ ٥١٢ − ٤٨٨ ٤٤٣

أ) ١٦٩ ج) ١٦١

ب) ١ ٠٦٩ د) ١ ٠٦١

# بڕی ژمارەیی
## Expression

**پێداچوونەوەی خێرا**

١. ٧ + ■ = ١٠
٢. ■ + ٨ = ١٧
٣. ■ − ٩ = ٩
٤. ٢٢ − ■ = ١٤
٥. ١٩ − ١٤ = ■

**زاراوەکان**

بڕی ژمارەیی expression

### فێربە

**گوڵەکانی بەهار** نازدار ١٢ گوڵی هەبوو، نازەنین ٤ گوڵی تر پێدا. نازدار ٣ گوڵی دا بە مامۆستاکەی. نازدار چەند گوڵی لا ماوە؟
دەتوانی پشت ببەستیت بە کەوانەکان بۆ دەربڕینی بڕی ژمارەیی.

(١٢ + ٤) − ٣ بیربکەوە: ١٢ کۆ ٤ پاشان کەم ٣.

**بڕی ژمارەیی** ژمارەکان و هێماکانی کردارەکانی ئەژمێرکردن لەخۆ دەگرێت، بەڵام هێمای یەکسان لە خۆناگرێت.

بەهای بڕی (١٢ + ٤) − ٣ ئەژمێر بکە.

(١٢ + ٤) − ٣ ١٢ و ٤ کۆبکەوە
↓
١٦ − ٣ ٣ لە ١٦ دەربکە
↓
١٣

هەروەها بەهای بڕەکە بریتییە لە ١٣. نازدار ١٣ گوڵی لاماوەتەوە.



### نموونەکان

**أ** بەهای (٥ − ٣) + ٦ ئەژمێر بکە.

(٥ − ٣) + ٦ ٣ لە ٥ دەربکە
↓
٢ + ٦ ٢ و ٦ کۆبکەوە
↓
٨

کەواتە (٥ − ٣) + ٦ = ٨

**ب** بەهای ١٢ − (٤ + ٢) ئەژمێر بکە.

١٢ − (٤ + ٢) ٤ و ٢ کۆبکەوە
↓
١٢ − ٦ ٦ لە ١٢ دەربکە
↓
٦

کەواتە ١٢ − (٤ + ٢) = ٦

- نموونەی أ بەچی جیاوازە لەگەڵ نموونە ب؟

## ساغبکەوە

**١** ڕۆڵی کەوانەکان شرۆڤە بکە لە ئەژمێرکردنی بەهای بڕی ژمارەیی.

**هەنگاوی یەکەمت شرۆڤە بکە پاشان ئەژمێربکە.**

**٢** (٤+٣) - ١٠ **٣** (١ - ٣) + ٩ **٤** ٤١ + (٢ - ١٦)

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**لە سەرەتا چی دەکەی شرۆڤە بکە پاشان ئەژمێربکە.**

**٥** (٢+ ٧) - ١٧ **٦** (٥ - ١٣) + ٢٠ **٧** ٨- ( ٦ - ١٨)

**ئەژمێربکە.**

**٨** (٦ - ١٩) + ٧ **٩** ٥ - (٧ + ٨) **١٠** (١٢ - ٢٢) + ١٣

**١١** (٨- ١٦) + ٤٠ **١٢** (٨ + ٢٦) - ٥٣ **١٣** ٣٠ - (٦٢ + ٢١)

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** **خشتەی لای چەپ بەکاربهێنە بۆ شیکاری پرسیارەکانی ١٤ و ١٥.**

**١٤** فرۆشتنی ڕووەکەکان لە فرۆشگای سەوز لە مانگی مایسدا چەندی زیاترە لە فرۆشتنی مانگی ئادار؟

**١٥** فرۆشتن لە مانگی ئادار و نیسان بەیەکەوە چەندی زیاترە لە مانگی حوزەیران؟



فرۆشتن لە فرۆشگای سەوز

| مانگ | ڕووەکی فرۆشراو |
| --- | --- |
| ئادار | ١ ٩٠٣ |
| نیسان | ١ ٥٦٧ |
| مایس | ٣ ٠٠٠ |
| حوزەیران | ٢ ٥٤٠ |

**١٦** ڕێکان ٣٥ - ١٤ + ٧ = ١٤ نووسی و لەبیری کرد دوو کەوانە دانێت. ئایا دەتوانی یارمەتی ڕێکان بدەیت و کەوانەکان لە شوێنی گونجاودا دانێیت؟

**١٧** **بنووسە** شرۆڤە بکە چۆن بەهای بڕی ٣٤ - (٢٧ - ١٥) ئەژمێر دەکەی.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**١٨**
```
  ٧ ٩٨٤
  ٦ ٨٢٥-
```

**١٩**
```
  ٢٧ ٣٣٧
  ١٩ ٤٤٣+
```

**٢٠** ٣٦٧ ٠٩٤ لەسەر شێوەی پیتی بنووسە.

**٢١** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

بەهای ڕەنووسی ٧ لە ژمارە ١٧ ٩٦١ ٠٩٩ کامەیە؟

أ ٧ ٠٠٠ ج ٧٠٠ ٠٠٠

ب ٧٠ ٠٠٠ د ٧ ٠٠٠ ٠٠٠

## ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان
### نموونەیەك پێکبهێنە
### Problem Solving Strategy
### Make a Model

**پێداچوونەوەی خێرا**

1. ١٩ = ▢ + ٨ + ٦
2. ١٨ = ▢ + ٧ + ٢
3. ١٦ = ٤ + ▢ + ٥
4. ١٧ = ٨ + ٣ + ▢
5. ١٥ = ٦ + ▢ + ٤

**پرسیار** دڵشاد و شنەی خوشکی ئارەزووی یاری شەترەنج دەکەن. شنە ٨ خولی بردەوە، دڵشاد دوو خولی بردەوە، پاشان ٦ خولی تری بردەوە، شنە ڕۆژی دووەم ٣ خولی تری بردەوە. دڵشاد دەبێ چەند خولی تر بباتەوە بۆ ئەوەی بەرامبەر بێت لەگەڵ شنە؟

**تێبگە Understand**

- داواکراو چییە؟
- ئەو زانیارییانەی بەکاری دێنیت چییە؟
- ئایا زانیاری تر هەیە بەکارت نەهێنابێت چییە؟

**پلاندانانی Plan**

- کام ڕێگا بەکاردەهێنیت بۆ شیکارکردنی پرسیارەکە؟

نموونەیەك دروست بکە بۆ ئەوەی ڕوونی بکەیتەوە کەوا دڵشاد پێویستە چەند خول بباتەوە تاکو بەرامبەر بێت لەگەڵ شنە. پەپکەکانی ژماردن بەکاربهێنە نواندن بۆ ئەوەی بزانی شنە چەند خولی بردۆتەوە و دڵشاد چەند خولی بردۆتەوە.

**شیکار بکە Solve**

- چۆن ئەو ڕێگایە بەکاردێنیت لە شیکارکردندا؟

تەختەی کارکردن و پەپکەکانی ژماردن بەکاربهێنە بۆنواندنی ژمارەی خولەکانی کە هەریەکە لە دڵشاد و شنە بردویانەتەوە.

| خولەکانی شنە | خولەکانی دڵشاد |
| --- | --- |
| ٨ + ٣ | ٢ + ٦ + ▢ |
| ١١ | ٨ + ٣ |
| | ١١ |

ڕستەی یەکسان بوون بنووسە کە ئەم نموونەیە دەردەبڕێت:

٨ + ٣ = ٢ + ٦ + ٣

کەواتە دڵشاد پێویستە ٣ خول بباتەوە.



**ساغبکەوە Check**

- چۆن ڕاستی وەڵامەکەت ساغ دەکەیتەوە؟

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**نموونەیەك دروست بکە بۆ شیکاری ڕاهێنانەکانی ١ تا ٣.**

١ پاش ئەوەی دڵشاد و شنە بەرامبەر بوون لە یاری شەترەنج. دڵشاد ٥ خولی نوێ ی بردەوە. دەبێت شنە چەند خولی تر بباتەوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بەرامبەر بێتەوە لەگەڵ دڵشاد؟

٢ هۆگر ٨ پێنووسی دا بە هێمن، ١٥ پێنووس لای هۆگر مایەوە. وە پێنووسەکانی هێمن بوو بە ١٩ پێنووس. ژمارەی پێنووسەکانی هێمن چەند بوو؟

٣ **هەڵەکە لەکوێدایە؟** لە یاری شەترەنج سالار ٨ سەربازی بەدیل گرت بەڵام سەردار ٣ سەربازی بە دیل گرت، پاشان ٤ سەربازی تر. سەردار نموونەیەکی دروست کرد و بڕیاری دا کە پێویستی بەدیل گرتنی ٤ سەربازی تر هەیە بۆئەوەی یەکسان بێت لەگەڵ سالار. شرۆڤەی بکە سەردار لەکوێ هەڵەی کرد، وەڵامی ڕاست بنووسە.

### ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان

- هێڵکارییەك یان وێنەیەك بکێشە
- **نموونەیەك دروست بکە یان بەکردار جێ بەجێ بکە**
- لیستێکی ڕێك پێکبهێنە
- بەدوای شێواز بگەڕێ
- خشتەیەك یان وێنەیەکی ڕوون کردنەوەیی پێکبهێنە
- بخەملێنە و ساغ بکەوە
- بە هەنگاوەکانتا بگەڕێوە
- پرسیارێکی ئاسانتر شیکار بکە
- هاوکێشەیەك بنووسە
- دەرئەنجامی ژیربێژی بەکاربهێنە



## ڕاهێنان لەسەر چەند ڕێگایەکی جیاواز

٤ هەریەکە لە ■ بەرامبەر ٤ ◆
هەریەکە لە ◆ بەرامبەر ٢ ●
زانا ٢ ■ ی هەیە. دانا ١٠ پارچە لە ◆ و ● بەرامبەرە بە ئەوەی زانا هەیەتی، دانا چەندی لە ◆ وە چەندی لە ● هەیە؟

٥ هۆگر ٦ پێنووسی هەیە، هەڤاڵ ٤ پێنووسی زیاتری هەیە، جەمیل ١٣ پێنووسی هەیە و ٣ پێنووسی بزر کرد. هۆگر دەبێت چی بکات تاکو پێنووسەکانی ببێتە هێندی پێنووسەکانی جەمیل؟

٦ سەکۆ «مینبەر» ی مزگەوتێك نەخشێنرابوو بە وێنەی مانگ و ئەستێرە. ژمارەی ئەستێرەکان دوو ئەوەندەی ژمارەی مانگەکان بوو، کۆی مانگەکان و ئەستێرەکان ٢٤ بوو، ژمارەی مانگەکان چەندە و ژمارەی ئەستێرەکان چەندە؟

٧ ژمارەی ستوونەکان لەلای باشوری مۆزەخانەیەك یەکسانە بە ژمارەی لای باکوریەوە. خالد لەلای باشورەوە ٤ ستون و ٣ستون و ٦ ستوونی ژمارد. بەڵام لەلای باکورەوە ٥ ستوون و ٤ ستونی ژمارد. ژمارەی ستونەکانی کە لە لای باکور ماوەتەوە چەندە ؟

# پێداچوونەوە
# Review

## دڵنیا بوون لە زاراوەکان و چەمکەکان Check Vocabulary and Concepts

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

| |
|---|
| خەمڵاندن Estimate |
| بڕی ژمارەیی Expression |
| سەرجەم Sum |

١ کاتێك ژمارەیەك نزیك دەکەیتەوە پێش ئەوەی کۆبکەیتەوە یان لێدەربکەی، ئەوا بە ئەنجامەکەی دەوترێت ــ؟ــ .

٢ ــ؟ــ هێمای یەکسان بوون لەخۆ ناگرێت.

## دڵنیا بوون لە کارامەییەکان Check Skills

سەرجەم یان جیاوازی بخەملێنە.

٣ $٣٢\,٨٩٥ + ٢٧\,٩٨٢$

٤ $٤\,٦٦٩ - ١\,٠٢٨$

٥ $٥٣٨\,١٩٥ + ٢٧٣\,٩٨٢$

بەهزر ئەژمێر بکە. ئەو ڕێگایەی بەکاری دەهێنیت شرۆڤە بکە.

٦ $٢٧ - ٤٣$

٧ $٣٧ + ٥٤$

٨ $٨٩ + ١٧$

ئەژمێر «هەژمێر» بکە. ئەو ڕێگایەی بەکاری دەهێنیت شرۆڤە بکە.

٩ $٣\,٨٥٢ + ١\,٧٨٤$

١٠ $٥\,٩٢٥ - ٢\,٣٧٨$

١١ $٨\,٥٨٦ - ٤\,٤٥٥$

ئەژمێر بکە.

١٢ $(١٢ - ٤٠) + ٢٥$

١٣ $(١٤ + ١٣) - ١٥$

١٤ $(٤٠ - ١٢٧) - ٢٧$

ژمارەی نادیار بنووسە.

١٥ $■ + (٢٤ + ١٨) = ٥٢$

١٦ $■ - (١٢ - ٣٧) = ٤٨$

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان Check Problem Solving

نموونەیەك دروست بکە بۆشیکاری هەردوو پرسیاری ١٧ و ١٨ .

١٧ شازاد و شاهۆ لەیاری شەترەنج بەربەرەکانێ یەکتر دەکەن، لە ڕۆژی یەکەم شازاد ٧ خولی بردەوە و شاهۆ ٣ خولی بردەوە پاشان ٦ خوول. لە ڕۆژی دووەم شازاد ٥ خولی بردەوە. شاهۆ پێویستە چەند خولی تر بباتەوە لە ڕۆژی دووەم بۆ ئەوەی لەگەڵ شازاد بەرامبەر بێ لە بەدەست هێنانی هەردوو ڕۆژدا؟

١٨ لەگەشتی ژمارە ١٠٢ دا ٢٣ گەشتیار هەبوو. هەندێ گەشتیار چوونە پاڵیان ژمارەیان بووە ٣٠. چەند گەشتیار چوونە پاڵیان؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## Standardized Test Prep

**ئاگاداربە! Tip!**

- هەموو وردەکارییەکان بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت بۆ پرسیار.
- وەڵامەکەت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانی ١ تا ٨.**

**١** نزیککراوەی ژمارە ٦٤٥ ٤٨٦ بۆ نزیکترین سەد هەزار کامەیە؟

| | |
|---|---|
| أ ٦٠٠ ٠٠٠ | ج ٦٤٥ ٠٠٠ |
| ب ٦٤٠ ٠٠٠ | د ٦٥٠ ٠٠٠ |

**٢** هێمای گونجاو کامەیە؟

٣ ٧٢٤ ٢١٩ ● ٣ ٧٢٣ ٧٢٢

| | |
|---|---|
| أ > | ج = |
| ب < | د ÷ |

**٣** بەهای بڕی ١٢ − (٧ + ٢) چەندە؟

أ ٣  ب ٥  ج ٧  د ٩

**٤** ٤٠٧ ٤٦٢ + ٢٥٥ ٢٩٤

| | |
|---|---|
| أ ٦٥٢ ٧٥٦ | ج ٧٥٢ ٧٥٦ |
| ب ٦٦٢ ٧٥٦ | د ٦٦٢ ٦٥٦ |

**٥** باشترین خەمڵاندن بۆجیاوازی ٧٢٩ ٣١٢ − ٢٨٤ ٣٠٦ کامەیە؟

| | |
|---|---|
| أ ٤٠٠ ٠٠٠ | ج ٥٠٠ ٠٠٠ |
| ب ١ ٠٠٠ ٠٠٠ | د ٤٥٠ ٠٠٠ |

**٦** بەهای جیاوازی ٨ ٠١٤ − ٦ ٤٣٩ کامەیە؟

| | |
|---|---|
| أ ١ ٦٧٦ | ج ٢ ٦٧٦ |
| ب ١ ٧٧٦ | د جگە لەوانە |

**٧** شێوەی ڕەنووسی بۆ ژمارە سێ سەد و چوار هەزار و حەڤدە کامەیە؟

| | |
|---|---|
| أ ٣٠٤ ٠٠٧ | ج ٣٤٠ ١٧٠ |
| ب ٣٠٤ ١١٧ | د ٣٠٤ ٠١٧ |

**٨** دلێر بایی ١٧ هەزار دینار پێداویستییەکانی قوتابخانەی کڕی. ٢٥ هەزاری دا بە فرۆشیارەکە. باشترین خەمڵاندن کامەیە کە دەبێ فرۆشیارەکە بۆی بگەڕێنێتەوە؟

| | |
|---|---|
| أ ١٠ | ج ٣٠ |
| ب ٢٠ | د ٤٠ |

## ئەوەی دەیزانی بینووسە — Write What You Know

**٩** چۆن ٣٨ + ٩٢ ئەژمێر دەکەی بەهزر؟ شرۆڤەی بکە.

**١٠** سیروان ١٢ هەزار دیناری هەیە، هەزاریەکی لێ خەرج کرد بۆ خواردنەوە و ٣ هەزاریش بۆ خواردن. کەوانەکان بەکاربهێە بۆ دەربڕینی ئەو بڕەی ماوەتەوە لەلای بە دوو ڕێگای جیاواز. پاشان شرۆڤەی بکە چۆن بەهای هەر بڕێك دەدۆزیتەوە؟

بەشی ٣

# چارەسەرکردنی پێدراوەکان و کات

# Organize Data and Time

نەوت پێکدێت لە ئەنجامی شیبوونەوەی بەکتریایی لەسەرخۆ «هێدی هێدی» لە ماددە ئەندامییەکانی گیانەوەری یان ڕووەکی کە بە دەیان و سەدان و سەدان ملیۆن ساڵ پێش ئێستا چوونەتە ناو دەریاکان و چینێکی نیشتووی پێکهێناوە. لە ساڵەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق لە بیستەکاندا نەوت لە عیراق دەرهێنرا.

**شیکاری پرسیارەکان**

خەملاندنێك بۆ بەرهەمهێنانی نەوت لە عێراق لە ساڵەکانی ١٩٨٥ تا ١٩٨٩ بنووسە.



# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know

ئەم لاپەرەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون
لە هەبوونی ئەم زانیارییانە کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

## ئەستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی Bar Graphs

**ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی بەکاربهێنە بۆ ڕاهێنانی ١ تا ٥.**




١ ناونیشانی ئەم وێنە ڕوونکردنەوەییە چییە؟

٢ کام هۆکار زیاتر بەکارهاتووە؟

٣ چەند قوتابی بە ئوتومبێل دەچن بۆ قوتابخانە؟

٤ چەند قوتابی لە ستوونە ڕوونکردنەوەییەکە هاتووە ؟

٥ ژمارەی ئەو قوتابییانەی کە پاس بەکاردەهێنن چەند زیاترە لەوانەی کە بەپێ دەچن؟

## نیو کاتژمێر «دەمژمێر» و چارەکە کاتژمێر
## Time to The Half and Quarter Hour

**کاتەکە بنووسە.**

٦ ٧ ٨ ٩



**کاتەکە بەشێوەی ڕەنووسی بنووسە.**

١٠ سێ و سی خولەك

١١ یەك و چارەك

١٢ دە کەم چارەك

## کات بە خولەك Time to The Minute

**کات بنووسە.**

١٣ ١٤ ١٥ ١٦



**کات بەشێوەی ڕەنووسی بنووسە.**

١٧ دە و ٢٣ خولەك

١٨ یەك کەم دوو خولەك

١٩ هەشت کەم ١٧ خولەك

وانەی ١

# ناوەڕاستە و مۆد «المنوال»

## Median and Mode

بەدەست

**پێداچوونەوەی خێرا**

١) ■ = ٧٠ + ٣١٥

٢) ■ = ٢٩٠ − ٨١٧

٣) ■ = ٤٣ + ٢٥٧

٤) ■ = ٤٣٠ − ١٠٠٠

٥) ■ = ٢٤ + ١٦ + ٢٥ + ١٥

**زاراوەکان**

مۆد Mode ناوەڕاستە Median

### بدۆزەوە

قوتابیان لە وانەی زانستەکاندا بەرزترین پلەی گەرمییان لە ماوەی ١١ ڕۆژی مانگێکدا تۆمارکرد. مۆد و ناوەڕاستە لەم کۆمەڵەیەدا دیاربکە.

| ڕۆژ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پلە | °٣٥ | °٣٢ | °٣٢ | °٣٢ | °٣٥ | °٣٠ | °٢٩ | °٢٩ | °٢٧ | °٢٧ | °٣٠ |

### چالاکی

**کەرستەکان** : کارتەکان

**هەنگاوی ١**

°٣٢ °٣٠ °٢٩ °٢٨ °٣٥

بۆ دۆزینەوەی مۆد:

پلەی گەرمی لەسەر کارتەکان بنووسە. کارتەکان لێك جودا بکەوە بەپێ ی ژمارەکان.

**مۆد** ئەو ژمارەیەیە کە زیاتر لە ژمارەکانی تر دووبارە دەبێتەوە.

لە توانادایە زیاتر لە مۆدێك هەبێت، وە دەشێت مۆد نەبێت.

**هەنگاوی ٢**

؟

بۆ دۆزینەوەی ناوەڕاستە:

کارتەکان لە بچووکەوە بۆ گەورە ریزبکە.

کارتێك لەلای یەکەم وەربگێڕەوە کارتێکی تر لەلاکەی تر وەربگێڕە، لەسەر ئەم شێوازە بەردەوام بە تا نزیك دەبیتەوە لە کارتەکەی ناوەڕاست ژمارەی لەسەر کارتەکەی کۆتاییە لە ناوەڕاست پێی دەوترێت **ناوەڕاستە**.




• ناوەڕاستەی پلەکانی گەرمایی کامەیە؟ مۆد کامەیە؟

### هەوڵبدە

**پلەی ٢٧ بۆ ڕۆژی دوانزەهەم و پلەی ٢٩ بۆ ڕۆژی سیانزەهەم بۆ خشتەی سەرەوە زیاد بکە.**

أ) مۆد دیار بکە

ب) ناوەڕاستە دیاربکە

## ببەستەوە




دەتوانی ناوەڕاستە و مۆد بەبێ بەکارهێنانی کارتەکان بدۆزیتەوە تەمەنی بەشداربووان لە پێشەنگای زانستەکان لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزبکە.

٩، ٩، ٩، ٩، ٩، ٩، ١٠، ١٠، ١٠، ١١، ١١، ١٢، ١٢

مۆد بریتییە لە ٩ ناوەڕاستە بریتییە لە ١٠




زۆر جار مۆد بەکاردێت کاتێك کۆمەڵەکان لە شت پێك بێت نەك لە ژمارەکان. سەرنج بدە خشتەی گیاندارانی دەریا، دۆلفین زۆرترین وەڵامی بەدەست هێنا، دۆلفین لەم کۆمەڵەیەدا مۆدە.

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**ناوەڕاستە و مۆد لە هەریەك لە دوو ڕاهێنانی ١ و ٢ دا دیار بکە.**

١

نمرەکانی ڕەوەز لە تاقیکردنەوەکانی زانستەکان

| تاقیکردنەوە | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
|---|---|---|---|---|---|
| نمرە | ٨٨ | ٩٥ | ٦٧ | ٨٦ | ٩٥ |

٢

پلەی گەرمی

| ڕۆژ | یەك شەممە | دوو شەممە | سێ شەممە | چوار شەممە | پێنج شەممە | هەینی | شەممە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پلە | ٣١ | ١٧ | ١٨ | ١٥ | ١٩ | ٢٣ | ٣١ |

٣ **هەڵەکە لەکوێدایە؟** هەردی وا دەزانێ کە ناوەڕاستە لەم خشتەیەی خوارەوەدا ٢٢٠، وە مۆدیش بریتییە لە ١٧٠ هەڵەی هەردی شرۆڤە بکە و وەڵامە ڕاستەکە بنووسە.

بلیتی پێشبرکێی ئەسپەکان

| هەفتە | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
|---|---|---|---|---|---|
| بلیت | ١٥٠ | ١٧٠ | ٢٢٠ | ١٦٠ | ٢٢٠ |

٤ **دەرئەنجام** ڕۆژان لە ٦ تاقیکردنەوەدا نمرەکانی ٨٩، ٨٨، ٩٣، ٨٨، ٨٥، ٩٣ بەدەست هێنا، پاش بەدەستهێنانی نمرەی تاقیکردنەوەی حەفتەم، مۆد بوو بە ٩٣، ناوەڕاستە لە حەفت تاقیکردنەوەکە دیاربکە.

٥ بەرزترین پلەی گەرمای شارەکەت لە ماوەی یەك هەفتەدا تۆمار بکە، پاشان ناوەڕاستە و مۆد لە کۆمەڵەی پلەکانی تۆمارتکردووە دیاربکە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

هێمای < یان > یان = لەشوێنی ● دابنێ لە ڕاهێنانی٦ و ٧.

٦ ٧٤٠٠ ● ١٠٠٠ − ٧٥٠٠

٧ ١٣٠٠ + ٧٠٥٩ ● ٨٣٩٥

٨ ئەمیر دەیەوێت ماوەی ٨٣٢کم ببڕێت، ڕۆژی پێنج شەممە٤٥٣کم بڕی، پێویستە چەندی تر ببڕێت بۆ تەواوکردنی گەشتەکەی؟

٩ ٩١ + ١٠٩ + ٢٨٧

١٠ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە ٥٦ + (٣٩ − ٦٨)

أ ٥١ ج ٧٥

ب ٨٥ د ٨٧

وانەی ٢

# خاڵەکان لەسەر تۆڕی چوارگۆشەکان

## Coordinate Grid

### پێداچوونەوەی خێرا

١) ٢٨ ÷ ٤ = ■

٢) ٥٦ ÷ ■ = ٧

٣) ٣٥ ÷ ٥ = ■

٤) ٤٥ ÷ ٥ = ■

٥) ٣٠ ÷ ٣ = ■

### زاراوەکان

تۆڕی چوارگۆشەکان **Grid**

جووتە ڕێکخراو **Order pair**

### فێربە

**بۆلای ڕاست برۆ** لەسەر ئەم تابلۆیە وێنەی چەند گیانداری دارستان کێشراوە. ئالان چی دەڵێت تاوەکو شوێنی فیلەکە لەسەر تابلۆیەکە دیاربکات؟

هێڵەکانی ئاسۆیی و ئەستوونی **تۆڕی چوارگۆشەکان** پێکدێنن.




لەخاڵی سفرەوە دەست پێبکە.دوو چوارگۆشە بەرەو لای ڕاست برۆ، پاشان ٣ چوارگۆشە بەرەو سەرەوە برۆ شوێنی فیلەکە لە خاڵی (٢ ، ٣) دایە.

(٢ ، ٣)

ژمارەی یەکەم ئەوە دیار دەکات کە چەند چوار گۆشە بەرەو لای ڕاست بجولێیت بە دەستپێکردن لە سفرەوە.

ژمارەی دووەم ئەوە دیار دەکات کە چەند چوارگۆشە بەرەو سەرەوە بجولێیت بە دەستپێکردن لە سفرەوە.

**لەبیرنەکەی** هەر **جووتە ڕێکخراوێك** خاڵێك لەسەر تۆڕی چوارگۆشەکان دەنوێنێت.
ژمارەکانی ٢ و ٣ جووتێ پێکدێنێت بە جووتی (٢ ، ٣) دەوترێت جووتە ڕێکخراو.

### نموونە

جووتە ڕێکخراوی (٥ ، ٤) کام گیاندار دەنوێنێت؟

لە سفرەوە دەست پێبکە.

٥ چوارگۆشە بۆ لای ڕاست برۆ.

٤ چوارگۆشە بۆ لای سەرەوە برۆ.

جووتە ڕێکخراوی (٥،٤) مەیموون نیشان دەدات.

- ئەوە بڵێ کە چۆن ئەو جووتە ڕێکخراوە دەدۆزیتەوە کە جاڵجاڵۆکە پیشان دەدات.



▲ جاڵجاڵۆکە



▲ ماری ئەلبوا

## ساغبکەوە

**١** **باس بکە چۆن خاڵەکانی (١٢، ١١) لەسەر تۆڕی چوارگۆشەکانی «١٢جار١٢» دەدۆزیتەوە.** مانای تۆڕی چوارگۆشەکان ١٢ چوارگۆشەی ئاسۆیی و ١٢ چوارگۆشەی ستوونی تێدایە.

**تۆڕی چوارگۆشەکانی لاپەڕەی پێشوو بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانی ٢ تا ٥.**

**٢** ئایا خاڵی (٤ ، ٣) هەمان خاڵی (٣ ، ٤) ـە؟ باسی بکە.

**خاڵی ئەو جووتە ڕێکخراوە بنووسە کە وێنەی ئەم گیاندارانەی دەکەوێتە سەر.**

**٣** پڵنگ　　**٤** وورچ　　**٥** زەرافە

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**تۆڕی چوارگۆشەکانی لاپەڕەی پێشوو بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانی ٦ تا ١١.**
**جووتە ڕێکخراو بنووسە بۆ خاڵی کە وێنەی ئەم گیاندارانەی دەکەوێتە سەر.**

**٦** چۆلەکە　　**٧** مار　　**٨** کەرە کێوی

**٩** مشك　　**١٠** ئاسك　　**١١** تیمساح




**تۆڕی چوارگۆشەکانی بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانی ١٢ تا ١٧.**
**ئەوە پیتە بنووسە کە دەکەوێتە سەر خاڵی جووتە ڕێکخراو.**

**١٢** (٣ ، ٦)　　**١٣** (٣ ، ١)

**١٤** (٤ ، ٤)　　**١٥** (٦ ، ٢)

**١٦** (١ ، ٧)　　**١٧** (٢ ، ٣)

**١٨** **دەرئەنجام** ساڤا ووتی کەرەکێویەکە لەسەر خاڵی (٢ ، ١)ـە، مریەم ووتی فیل لەسەر خاڵی (٢ ، ٣)ـە. ئەو جووتە ڕێکخراوە کامەیە بۆ خاڵی نێوان کەرەکێوی و فیلەکە؟

**١٩** **هەڵە لەکوێیە؟** ئاکۆ ووتی «بۆ ئەوەی خاڵی (٢ ، ٣) بدۆزمەوە، لەخاڵی سفر دەست پێدەکەم ٣ چوارگۆشە بۆ لای ڕاست و ٢ بۆ سەرەوە دەجووڵێم، ئاکۆ لەکوێ هەڵەی کردووە ؟ هەڵەکە ڕاست بکەوە.

**٢٠** چالاك ٣ پارچە دراوی جۆری ٥٠٠ دیناری و دوو پارچەی ١٠٠٠ دیناری و دوو پارچەی ٢٥٠ دیناری لایە. سارا ی خوشکی ٤ پارچە دراوی ٥٠٠ دیناری و ٣ پارچەی ١٠٠٠ دیناری و دوو پارچەی ١٠٠٠٠ دیناری هەبوو. کامیان دراوی « پارەی» زیاتری پێیە؟ وە چەندی زیاترە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**٢١** لە گەورەوەترین بۆ بچووکترین ریزبکە.
٢٩٤٦ ، ٢٩٦٤ ، ٢٦٤٩

**٢٢** ٧٢٦٩ + ١٤٨٩ = ■

**٢٣** ٢٠٦٤ − ١٥٣٢ = ■

**٢٤** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — جیاوازی لە نێوان ٥٦٧ و ٢٨٨ چەندە؟

أ ٢٧٩　　ج ٣٧٩

ب ٢٨٩　　د ٨٥٥

وانەی ٣

# هێڵی ڕوونکردنەوەیی
# Graphical Line

### پێداچوونەوەی خێرا

١. ■ = (١٢ − ١٥) + ١٧

٢. ■ = (١٢ + ١٨) − ٤٥

٣. ■ = ١٠ − (٢٥ + ٢٥)

٤. ■ = ١٦ + (٧ − ٢٣)

٥. ■ = (١٧ + ٤٨) − ٧٦

### زاراوەکان

هێڵی ڕوونکردنەوەیی — Graphical Line

## فێربە

دەتوانی ڕوون بکەیتەوە کە چۆن پێدراواکان بەپێ ی دەمەکان دەگۆڕێت بەبەکارهێنانی **هێڵی ڕوونکردنەوەیی**

### نموونە

بیر لە هێڵی ڕوونکردنەوەیی بکەوە. ئەو هێڵەی خاڵەکانی پێکەوە بەستووە گۆڕانی پلەی گەرما ڕوون دەکاتەوە . پلەی گەرما لەمانگی ئادارلە شاری دهۆك چەندە؟

**هەنگاوی ١**

پەنجەت لەسەر ستوونی مانگی ئادار لەخوارەوە دابنێ. دواتر پەنجەکەت بجولێنە بەرەو سەرەوە تا لەگەڵ خاڵی هێڵی ڕوونکردنەوەیی یەکتردەبرن.

**هەنگاوی ٢**

پەنجەت لە خاڵەکە بەرەولای چەپ بجولێنە تا ستوونی پلەی گەرما

خاڵی ئادار دەکەوێتە نزیکەی نێوان ٢٠ تا ٣٠ پلە.
کەواتە، پلەی گەرما لە مانگی ئادار نزیکەی ٢٥ پلەیە.

**پلەی گەرما لە دهۆك بۆ ماوەی ٦ مانگ**




**دەرئەنجام** باسبکە خاڵی مانگی تەمووز لە کوێ دادەنێت کاتێك دەزانی کە پلەی گەرما لەم مانگەدا ٤٣ پلەیە؟



**پلەی گەرما لە عەنکاوە بۆ ماوەی ٦ مانگ**




## ساغبکەوە

**هێڵی ڕوونکردنەوەیی بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانی ١ تا ٣.**

١. ئەو دوو مانگە دیار بکە کە پلەی گەرمیان لە ٤٨ پلەوە بۆ ٤٢ پلە دادەبەزێت «نزمدەبێتەوە».

٢. گەرمترین مانگ لە عنکاوە کامەیە؟

٣. جیاوازی نێوان بەرزترین و نزمترین پلەی گەرمی لە ماوەی شەش مانگدا لە عنکاوە کامەیە؟

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان




**وێنەی بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ شیکاری راهێنانی ٤ تا ٦.**

٤ کەمترین ژمارەی میوانەکان لەکام ساڵدا بوو؟

٥ لەکاتی کردنەوەی مۆزەخانەکە لە ساڵی ١٩٩٤ دا ٤٠ ٠٠٠ میوان سەردانیان کرد، ژمارەی میوانەکان لەنێوان ساڵی ١٩٩٤ وە ساڵی ١٩٩٩ گەیشتە چەند؟

٦ لە کام دوو ساڵ ژماری میوانان وەك خۆی ماوە؟

**هێڵێکی ڕوونکردنەوەیی گونجاو بۆ ڕاهێنان ٧ و ٨ بکێشە.**

٧

| ماوەکانی بەکارهێنانی تەلەفۆن | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕۆژ | یەك شەممە | دوو شەممە | سێ شەممە | چوارشەممە | پێنج شەممە |
| خولەك | ٢٥ | ٥٥ | ٥٠ | ٣٠ | ٣٠ |

٨

| ژماری یاریزانانی پاڵەوانی تۆپی پێ | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ساڵ | ١٩٩٧ | ١٩٩٨ | ١٩٩٩ | ٢٠٠٠ |
| ژمارە | ١٥٠ | ٢٢٥ | ٣٠٠ | ٣٧٥ |

٩ **پرسیارێك بنووسە** بەبەکارهێنانی وێنەی ڕوونکردنەوەیی پلەی گەرمایی شاری عەنکاوە کە لەلاپەڕەی پێشوودا هاتووە.

١٠ **دەرئەنجام** بەدوای ٣ ژمارەدا بگەڕێ کە سەرجەمیان بکاتە ١١٠ وە ناوەڕاستەیان ٤٠ بێت.




١١ ستوونە ڕوونکردنەوەییەکانی بەرامبەر بگۆڕە بۆهێڵی ڕوونکردنەوەیی.

١٢ مۆد ناوەڕاستە لە ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی بەرامبەر کامەیە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

١٣ ٣٥ ٨٤٢ − ١٨ ٧٦٤ = ■

١٤ ژمارە گەورەکە کامەیە ٤٦ ٧٣١ یان ٤٦ ٧٨١؟

١٥ مۆدی ئەم کۆمەڵەیە کامەیە؟ ٢ ، ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٦ ، ٧ ، ٧ ، ٩ ، ١١ ، ١١ ، ١١.

١٦ ناوەڕاستە لەم کۆمەڵەیەدا کامەیە؟ ٢ ، ٤ ، ٧ ، ٦ ، ٩ ، ٨ ، ١١ ، ١٠ ، ٥ ، ٤ ، ٦ ، ٩ ، ٩.

١٧ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) ژمارەی گەورەتر لە ١١ ٤٦٣ وە بچووکتر لە ١١ ٦٠٠ کامەیە؟

أ ١١ ٣٧٥ ج ١١ ٥٥٢

ب ١١ ٤٥٩ د ١١ ٦٧٣

١٨ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) لە باخچەکەدا ٥ قەفەز هەیە، هەر قەفەزێك ٣ بولبولی تێدایە، ژمارەی هەموو بولبولەکان چەندە؟

أ ٩ ب ١٠ ج ١٢ د ١٥

وانەی ٤

# ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان
## وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی پێکبهێنە
## Problem Solving Strategies
### Make a Graph

**پێداچوونەوەی خێرا**

1. ٨٨٧ − ١٠٠ = ■
2. ٣ × ٣ = ■
3. ٥٦٥ + ١٣٥ = ■
4. ١٣٥ − ١٠٢ = ■
5. ٩٥٠ − ١٢٥ = ■

**پرسیار** ئەم خشتەیە سەرجەمی خاڵە بەرزەکانی یاریزانە بەناوبانگەکانی تۆپی سەبەتە نیشان دەدات، بەرزترین سەرجەم لە خاڵەکان تۆمارکراوە بریتییە لە ٥٦ خاڵ لە ساڵی ١٩٩٤ دا تۆمارکرا، کام دووساڵ گەورەترین پاشەکشە لەنێوان سەرجەمی خاڵەکانیان تۆمارکرا.



سەرجەمی بەرز بۆخاڵەکان

| ساڵ | خاڵەکان |
|---|---|
| ١٩٩٣ | ٥٥ |
| ١٩٩٤ | ٥٦ |
| ١٩٩٥ | ٤٨ |
| ١٩٩٦ | ٤٦ |
| ١٩٩٧ | ٥٥ |
| ١٩٩٨ | ٤٥ |
| ١٩٩٩ | ٣٧ |

**تێبگە** Understand

- داواکراو چییە؟
- ئەو زانیاریانەی بەکاری دێنیت چییە؟
- ئایا زانیاری تر هەیە بەکارت نەهێنابێت؟ چین؟

**پلاندانێ** Plan

- کام ڕێگابەکاردەهێنی بۆ شیکاری پرسیارەکە

دەتوانی وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی بکێشی یارمەتیت بدات بۆ دەرخستنی پێدراوەکان وە بە ئاسانی بڕیاری لەسەر بدرێت.




**شیکاریبکە** Solve

- باشترین وێنەی ڕوونکردنەوەیی کامەیە کە یارمەتی شیکاری پرسیارەکە دەدات؟

وێنەی ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی بکێشە، پاشان بەراورد لەنێوان درێژی ستوونەکان بکە.

بیریکەوە لە وێنەی ڕوونکردنەوەیی لە ڕاستەوە بۆ چەپ. گەورەترین جیاوازی لە نێوان ساڵی ١٩٩٧ و ساڵی ١٩٩٨ دا دەردەکەوێت.

کەواتە، گەورەترین پاشە کشە لە نێوان ساڵی ١٩٩٧ و ساڵی ١٩٩٨ .

**ساغبکەوە** Check

- چۆن دڵنیا دەبیت لە ڕاستی وەڵامەکەت؟

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی پێکبهێنە پاشان شیکاری بکە.**

١ تەمەنی قوتابیان لە پۆلی وەرزشی بریتییە لە ١٠ ، ١١ ، ١٠ ، ١٤ ، ١٢ ، ١١ ، ١٢ ، ١٣ ، ١٢ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢
مۆد کامەیە؟

٢ ژمارەی ئەو چیرۆکانەی کە قوتابیانی پۆلی چوارەم خوێندویانەتەوە ١ ، ٠ ، ٢ ، ٢ ، ٠ ، ٠ ، ٠ ، ١ ، ٣ ، ٥ ، ١ ، ١ ، ١ ، ٢ ، ٠ ، ١ ، ٠ ، ٢. ناوەڕاستە کامەیە؟

٣ فرۆشگایەك لەیەك کاتژمێردا ١١ کراسی فرۆشت نمرەکانیان بریتی بوو لە ٤١ ، ٣٩ ، ٤٢ ، ٤٣ ، ٤٠ ، ٣٨ ، ٤٢ ، ٤٤ ، ٣٨ ، ٤٥ ، ٤٦ . مۆد کامەیە؟ ناوەڕاستە کامەیە؟

**خشتەی سەرژمێری بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانی ٤ و ٥.**

٤ ژمارەی ئەو درەختانەی کە قوتابیان چاندویانە لە باخچەی قوتابخانەکەیان چەندە؟

أ ٢٠ ج ٢٤
ب ٢٣ د ٢٥

٥ ژمارەی درەختە چێنراوەکانی ساڵی ٢٠٠٣ چەندیان زیاترە لە درەختە چێنراوەکانی ساڵی ٢٠٠٢ ؟

أ ٢ ج ٤
ب ٣ د ٥

**درەختە چێنراوەکانی باخچەی قوتابخانەی حیکمە**

| ساڵ | ژمارەی درەختەکان |
|---|---|
| ٢٠٠١ | 𝍸 III |
| ٢٠٠٢ | 𝍸 I |
| ٢٠٠٣ | 𝍸 𝍸 |

### ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان

- هێڵکاریەك یان وێنەیەك بکێشە
- نموونەیەك دروست بکە یان بەکردار جێبەجێ بکە
- لیستێکی ڕێك پێکبهێنە
- بەدوای شێواز بگەڕێ
- **خشتەیەك یان وێنەیەکی ڕوون کردنەوەیی پێکبهێنە**
- بخەملێنە و ساغبکەوە
- بە هەنگاوەکانتا بگەڕێوە
- پرسیارێکی ئاسانتر شیکار بکە
- هاوکێشەیەك بنووسە
- دەرئەنجامی ژیربێژی بەکاربهێن

## ڕاهێنان بە چەند ڕێگایەکی جیاواز

٦ خاوەنی کتێبخانەیەك ١٦٢٢ کتێبی مێژوو و ٩٨٦ کتێبی بیرکاری و ١٤٥٣ کتێبی بوارەکانی تر ئامار کرد، چەند کتێبی ئامار کردووە؟

٧ مام بایز بە ئوتومبێلەکەی ١٤٤کگم میوە و ٢٠٨کگم سەوزەی گواستەوە. بۆ نزیکترین دە نزیك بکەوە بۆ ئەوەی بخەمڵێنی کە مام بایز چەندی گواستۆتەوە؟

٨ هەلز سێ ئەوەندەی هەلبینی خوشکی مۆرووی هەیە، بە هەردووکیان لە نێوان ١٨ تا ٢٥ مۆروویان هەبوو. هەلبین چەند مۆرووی هەیە؟

٩ مامۆستا شیرین چاودێری ٦٠ قوتابی دەکات، ٢٨ قوتابی ئارەزوویان لە تۆپی پێ یە، ١٧ قوتابی ئارەزوویان لە مەلەیە، ١٥ قوتابی ئارەزوویان لە سواری پایسکیلە. وێنەی ستوونەکانی ڕوونکرنەوەیی بکێشە. مۆد دیاربکە.

١٠ دوو ژمارە ئەنجامی لێکدانیان ٣٦ وە سەرجەمی کۆکردنەوەیان ١٣ ئەم دوو ژمارەیە چین؟ جیاوازی لەنێوانیان چەندە؟

وانەی ٥

# خوێندنەوەی کات

## Reading Time

**پێداچوونەوەی خێرا**

کات پێش ١٥ خولەك بڵێ:

١ ٢:١٥ ٢ ١١:٣٠

٣ ٧:٠٠ ٤ ٥:٤٥

٥ ١:٠٠

**زاراوەکان**

چرکە (چ) Seconds(s)

### فێربە

**لەسەر ژوان؟** سەعید گەیشتە وێستگە «گەراج»ی پاسەکان بۆ ئەوەی سواری پاسی هێڵی دهۆك بێت کە لەکاتژمێر ١١ دەردەچێت. کات ئێستا لەسەر وێنەی کاتژمێرەکە دیارە. ئایا سەعید لەکاتی گونجاودا گەیشتووە یان پاسەکە ڕۆیشتووە؟ کاتژمێرەکە نیشاندەدات کە کاتەکە ١٠:٤٨ واتە ١٢ خولەك پێش یانزەیە.

کەواتە هێشتا کات ماوە بۆ سەعید تا سواری پاس ببێت.



### نموونە

أ




دەتوانی ئەم کاتە بەم شێوەی خوارەوە بنووسیت و بیخوێنیتەوە:

- ٩:٥٠
- نۆ و پەنجا خولەك
- دە خولەکی دەوێت بۆ دە

ب



دەتوانی ئەم کاتە بەم شێوەی خوارەوە بنووسیت و بیخوێنیتەوە:

- ٢:٢٤ و ١٦ چرکە
- دوو و بیست و چوار خولەك و شانزە چرکە
- ٢:٢٤:١٦

دەتوانی زانیارییەکانت لەسەر یەکەکانی کات بەکاربهێنی بۆ ئەوەی بخەملێنی چەند کاتت پێویستە بۆ جێبەجێکردنی چالاکییەکی دیاریکراو.

- دەتوانی کام چالاکییەك جێبەجێبکەیت لە چرکەیەکدا؟ لە خولەکێکدا؟

| یەکەکانی کات |
| --- |
| ٦٠ چرکە (چ) = ١ خولەك (خ) |
| ٦٠ خولەك = ١ کاتژمێر (ك) |
| ٢٤ کاتژمێر = ١ ڕۆژ |

### ساغبکەوە

١ ژمارەی چرکەکانی دوو خولەك چەندە؟

**کات بەشێوەی ڕەنووسی بنووسە.**

٢ شەش و ٣٨ خولەك ٣ دوو کەم ٥ خولەك ٤ ١٢ خولەکی دەوێت بۆ نۆ

**کات بەشێوەی ڕەنووسی بنووسە.**

٥ چوار و ١٧ خولەك

٦ پێنج کەم بیست خولەك

٧ حەفت کەم ١٣ خولەك

**ئەو کاتەی لەسەر کاتژمێر دیارە بە دوو شێوەی جیاواز بنووسە.**

٨


٩


١٠


١١



١٢



**کام یەکەی کات بەکارهاتووە بۆ پێوانی کات لە ڕاهێنانەکانی ١٣ تا ١٦؟**
**بنووسە أ یان ب یان ج یان د**

| أ ڕۆژەکان | ب کاتژمێرەکان | ج خولەکەکان | د چرکەکان |
|---|---|---|---|

١٣ بۆ نوقاندنی چاوت .

١٤ بۆ نوێژکردن.

١٥ خوێندنەوە بۆئامادە بوون بۆ تاقیکردنەوە.

١٦ بۆ بەسەر بردنی پشوی جەژنی قوربان.

١٧ **دەرئەنجام** مەحمود پلانی کاری ڕۆژێکی بەم شێوەیەی خوارەوە دارشت: ٣ کاتژمێر خۆشووشتن و نوێژکردن و نان خواردن، ٤ کاتژمێر بۆ سەردانی هەڤاڵەکانی، ٣ کاتژمێر بۆ شتومەك کرین لەبازار، ٣ کاتژمێر بۆ خوێندن، ١٠ کاتژمێر بۆ نووستن، ئایا مەحمود دەتوانێ ئەم کارانە لە ڕۆژێکدا ئەنجام بدات؟ شرۆڤەبکە.

١٨ هەمیشە مرۆڤ لە ماوەی ٦ چرکەدا جارێك چاوی خۆی دەنوقێنێ، لەماوەی ٣٠ چرکەدا چەند جار چاوی خۆی دەنوقێنێ؟ ئەی لە خولەکێکدا چەند جار؟

١٩ مرۆڤێکی پێگەیشتوو دەتوانێت ماوەی ٤ کم لە یەك کاتژمێردا بڕوات، ئایا لەماوەی ١٥ خولەکدا دەتوانێت چەند بڕوات؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

٢٠ ژمارەی سێ سەد و شەست و پێنج هەزار و هەشت سەدو چل و دوو بە شێوەی ڕەنووسی بنووسە.

٢١ ژمارەی قوتابییان لە قوتابخانەیەك ٥١٣ قوتابییە ٢٨٤ لەوانە قوتابی قۆناغی بنەڕەتین، ئەوانی مانەوە خوێندکاری ئامادەیین، ژمارەی خوێندکاران چەند کەمترە لە ژمارەی قوتابیان؟

**ژمارەی نادیار بنووسە.**

٢٢ (٥+١١) = ▢ +١٦

٢٣ ٦+٧+٧ = ▢ +١٤

٢٤ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە کامیان باشترین ڕێگایە بۆ دەرخستنی گەشەی ژمارەی دانیشتوان لە شار؟

أ ستوونی ڕوونکردنەوەیی
ب هێڵی ڕوونکردنەوەیی
ج خشتە
د وێنەدارەکان

وانەی ٦

# ئەژمێرکردنی ماوە «کات»

## Elapsed Time

**پێداچوونەوەی خێرا**

کات پاش ١٥ خولەك بڵێ:

١ ١٢:١٥ ٢ ٤:٣٠

٣ ١:٠٠ ٤ ١١:١٥

٥ ١:٤٥

**زاراوەکان**

ماوە «کات» Time

▶ فێربە

**پێشانگای رۆشنبیری** Cultural fair قوتابخانەی کوردستانی سەرەتایی پێشانگایەکی رۆشنبیری رێکخست. دەتوانی ئەم خشتەیە بەکاربهێنی بۆ ئەوەی بەرنامەی پێشانگاکە بزانێت.




### نموونە ١

چی نیشاندەدرێت لە ماوەی بەیانیان ؟

کاتژمێرەکانی نێوان نیوەشەو و نیوەڕۆ پێی دەوترێت کاتژمێری پێش نیوەڕۆ (پ.ن) وە کاتژمێرەکانی نێوان نیوەڕۆ و نیوەشەو پێیان دەوترێت کاتژمێری دوای نیوەڕۆ (د.ن) .




کەواتە، ماوەی پ.ن هەڵپەرکێی میللی و فیلمی زانستی نیشاندەدرێت.



### نموونە ٢

ماوەی پێشەنگاکە چەندە؟

دەتوانی کاتژمێر بەکاربهێنی بۆ ژماردنی کات لەسەرتاوە تا کۆتایی.




بیریکەوە: لە کاتژمێر ١٠:٠٠ پ.ن تا ٢:٠٠ د.ن ٤ کاتژمێری تەواو تێپەڕیوە.

بیریکەوە: لە کاتژمێر ٢:٠٠ د.ن تا کاتژمێر ٢:١٥ د.ن ١٥ خولەك تێپەڕیوە.

کەواتە، ماوەی پیشانگاکە ٤ ك و ١٥ خ.

## نموونە ٣

ماوەی پێشکەشکردنی شانۆگەریەکە چەندە؟

پێشکەشکردنی شانۆگەریەکە لە کاتژمێر ١:٤٥ د.ن دەستپێدەکات و لە کاتژمێر ٢:١٥ د.ن کۆتایی دێت.



**ڕێگای یەکەم**

لێدەرکردن بەکاربهێنە.

بیریکەوە: ١ك = ٦٠ خ

٢ ك + ١٥ خ = ١ ك + ٧٥ خ.

| | ١ | ٧٥ |
|---|---|---|
| | ~~٢~~ك | ~~١٥~~خ |
| − | ١ك | ٤٥خ |
| | ٠ك | ٣٠خ |

**ڕێگای دووەم**

بگەڕێوە سەر کاتژمێر و لە ١:٤٥ دەست پێبکە.




کەواتە ماوەی پێشکەشکردنی شانۆگەریەکە ٣٠ خولەك بوو.

## ساغبکەوە

**پ.ن یان د.ن بەکاربهێنە بۆ وەڵامدانەوە.**

١ کاتێ لە خەو هەڵدەستیت

٢ کاتێ نانی نیوەڕۆ دەخۆیت

٣ کاتێ ڕۆژ ئاوا دەبێت

**کۆبکەوە.**

٤
١٥خ و ٢ك
+ ١٥خ و ٤ك

٥
٢٠خ و ٦ك
+ ٤٠خ و ٥ك

٦
٣٥خ و ٣ك
+ ٤٥خ و ٤ك

**لێدەربکە.**

٧
٣٥خ و ٧ك
− ١٥خ و ٣ك

٨
١٠خ و ١٠ك
− ٤٥خ و ٤ك

٩
١٤خ و ٣ك
− ٣٧خ و ٢ك

**ماوەکە ئەژمێر بکە.**

١٠ سەرەتا : ٩:٣٠ پ.ن
کۆتایی : ١١:٥٠ پ.ن

١١ سەرەتا : ١٠:١٠ پ.ن
کۆتایی : ٢:٤٥ د.ن

١٢ سەرەتا : ١:٢٠ د.ن
کۆتایی : ٩:٠٥ د.ن

**خشتەی فیلمەکان بەکاربهێنە بۆشیکاری پرسیارەکانی ١٣ و ١٤.**

١٣ هەر فیلمێك کەی کۆتای دێت؟

١٤ فیلمی « فرینی هەڵۆ » لە کاتژمێر ٤:٠٥ د.ن کۆتایی دێت. کەی دەست پێدەکات؟



## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**پ.ن یان د.ن بەکاربهێنە بۆ وەڵامدانەوە.**

١٥ کاتی نانی بەیانی دەخۆیت

١٦ کاتی لە قوتابخانە دەگەڕێیتەوە

١٧ کاتی دەخەویت

**ماوەکە ئەژمێر بکە.**

١٨ سەرەتا : ٧:٣٥ پ.ن
کۆتایی : ٢:٣٠ د.ن

١٩ سەرەتا : ٩:١٠ پ.ن
کۆتایی : ١٠:١٧ د.ن

٢٠ سەرەتا : ١١:٣٥ پ.ن
کۆتایی : ١:١٠ د.ن

**کاتی کۆتایی دیاریکە.**

٢١ سەرەتا : ٨:٠٠ پ.ن
ماوە : ٢ ك ٤٥ خ

٢٢ سەرەتا : ١١:٥٠ پ.ن
ماوە : ٣ ك ١٠ خ

٢٣ سەرەتا : ١٠:١٠ پ.ن
ماوە : ٤ ك ٢٤ خ

**کاتی دەستپێکردن دیاریکە.**

٢٤ کۆتایی : ١١:١٠ پ.ن
ماوە : کاتژمێرێك

٢٥ کۆتایی : ١:١٥ د.ن
ماوە : ٢ك و ٣٠ خ

٢٦ کۆتایی : ١:٤٥ د.ن
ماوە : ٤ك و ١٠ خ

**بینووسەرەوە پاشان تەواو بکە.**

٢٧

| سەرەتا | ١٠:٥٠ پ.ن | | ١٠:٤٥ پ.ن |
|---|---|---|---|
| کۆتایی | | ٢:٣٠ د.ن | ٢:٢٢ د.ن |
| ماوە | ٣ك و ٥خ | ٢ك و ٤٠خ | |



ڕێکخستنی کاتەکانی بەشی ناوخۆیی قوتابیان

| له خەو هەستان | ٦:٤٢ |
|---|---|
| چوون بۆ قوتابخانە | ٧:٣٥ |
| گەڕانەوە لە قوتابخانە | ١١:٤٣ |
| یاریکردن | ٣:٢٨ |
| خواردنی ئێوارە | ٦:٥١ |
| نووستن | ٩:٣٠ |

**خشتەی بەرامبەر کاتەکانی یەکێك لە بەشە ناوخۆییەکان دیار دەکات.**
**خشتەکە بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانی ٢٨ تا ٣١.**

٢٨ ماوەی نێوان لە خەو هەستان و چوون بۆقوتابخانە چەندە؟

٢٩ کامیان زوورترە ماوەی نێوان گەڕانەوە لە قوتابخانە و یاری کردن یان ماوەی نێوان یاریکردن و نان خواردنی ئێوارە؟

٣٠ ماوەی نێوان لە خەو هەستان و یاریکردن چەندە؟

٣١ ماوەی نێوان نووستن و لە خەو هەستان نزیکەی چەندە؟

٣٢ **هەڵەکە لەکوێدایە؟** بارزان وادەزانێ کە ماوەی نێوان گەڕانەوە لە قوتابخانە و نووستن بریتییە لە ٢ ك و ١٣ خ، بارزان لە کوێدا هەڵەی کردووە؟ وەڵامی ڕاست بنووسە.

خشتەکە بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانی ٣٣ تا ٣٦.



خشتەی گەشتەکان

| کۆمپانیای فڕۆکەوانی | دەرچوون | گەیشتن |
| --- | --- | --- |
| ئەزمەر | سلێمانی ٦:٣٥پ.ن | بەغدا ٧:٥٥ پ.ن |
| زاگرۆس | هەولێر ٧:٣٠د.ن | بەسرا ١٠:٣٠ د.ن |
| کوردستان | هەولێر ٥:٤٥پ.ن | دیمەشق ٧:٥٥ پ.ن |

٣٣ ماوەی گەشت لە سلێمانی بۆ بەغدا چەندە؟

٣٤ لەم سێ گەشتە کامیان درێژترینیانە؟

٣٥ **دەرئەنجام** ئەگەر فڕۆکەیەك لە شاری هەولێر لە کاتژمێر ١١:١٠ پ.ن بەرەو شاری بەسرە دەرچوو، لە چ کاتێك دەگات؟

٣٦ **دەرئەنجام** ئەگەر فڕۆکەیەك کاتژمێر ٥:٤٥ پ.ن لە هەولێرەوە گەیشتە شاری دیمەشق. لە چ کاتێك دەرچووە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

بەهای ڕەنووسی شین بنووسە.

٣٧ ٤٥ ٦٢٣

٣٨ ٨٣ ٢٣٨

٣٩ ١٧٢ ٩٠٨

٤٠ ٢ ٤٩٨ ٧٦٢

٤١ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە ٢٧ + ٣٥ + ١١٨ ؟

أ ١٦٠ ب ١٧٠ ج ١٧٩ د ١٨٠

٤٢ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە هێمن ٣٢ کارتی وێنەداری هەیە هەژاری برای ١٨ کارتی پێدا، هەڤاڵ ٥ کارتی لە هێمن وەرگرت. هێمن چەند کارتی لا ماوە؟

أ ٣٢ − (١٨ − ٥)
ب ٣٢ + (١٨ − ٥)
ج ٣٢ + (١٨ + ٥)
د ٣٢ − (١٨ + ٥)

## شیکارکردنی پرسیارەکان

# کاتی گەشتەکان
# Flight Times

خشتەی بەرامبەر کاتی گەشتەکان لە فڕۆکەخانەی هەولێری نێودەوڵەتی دیار دەکات.

کاتی گەشتەکان لە فڕۆکەخانەی هەولێری نێودەوڵەتی

| بەیانی | نیوەڕۆ | ئێوارە | شەو |
| --- | --- | --- | --- |
| ٥:٠٢ | ١١:٣٦ | ٤:٤٤ | ٦:٠١ |

١ نێوان گەشتی بەیانی و گەشتی نیوەڕۆ چەند خولەکە؟ نێوان گەشتی نیوەڕۆ و گەشتی ئێوارە چەندە؟

٢ کارزان بە مەبەستی گەشت کردن لە کاتژمێر ٣:٤٥ لەماڵەوە هاتە دەر. ١٠ خولەك چوو بۆماڵی براکەی و چارەکێك بەڕێوە بوو بۆ فڕۆکەخانە. ئایا پێش گەشتی ئێوارە دەگاتە فڕۆکەخانە؟

٣ ئەگەر نۆرەی گەشتی کارزان لە بەیانی دەسپێبکات وە ماوەی گەشتەکەی ٥ ك و ٢٥ خ بخایەنێت ئەوا لە کام کات دەگات؟

وانەی ٧

# مانگەکانی زایینی

## Gregorian Months

### پێداچوونەوەی خێرا

کات دوای١ك و ٤٠خ بنووسە

١ ٢:١٥ د.ن

٢ ٩:٢٥ پ.ن

٣ ٤:١٣ د.ن

٤ ٧:٣٥ پ.ن

٥ ٨:٢٠ پ.ن

### زاراوەکان

| | |
|---|---|
| سالی زایینی | Gregorian year |
| مانگەکانی زایینی | Gregorian months |

### فێربە

کاك ئاوات ئاگاداری خێزانەکەی کردووە کە لەسەرەتای مانگی نیساندا سەردانی دەرەوەی ولات دەکات بۆ دامەزراندنی نوسینگەیەکی بازرگانی وە لەسەرەتای مانگی تشرینی دووەم دەگەڕێتەوە. کاك ئاوات چەند مانگ لە خێزانەکەی دووردەکەوێتەوە؟

**سالی زایینی** لە ٣٦٥ ڕۆژ پێکدێت کە دابەشکراوە بەسەر ١٢ مانگدا. بەو مانگانە دەوترێت **مانگەکانی زایینی**.

لە خشتەی بەرامبەردا ناوی مانگەکان و ژمارەی ڕۆژەکانی هەریەکە دیاردەکات. دەتوانی ناوی ئەم مانگانە لەسەر هێلێکی ڕاست بنوێنیت، وە لەسەرەتای مانگی نیسان تاکو دەستپێکی مانگی تشرینی دووەم بژمێری.




کەواتە، بەڕێز کاك ئاوات حەوت مانگ لە دەرەوە دەبێت.

| مانگەکانی زایینی | | | |
|---|---|---|---|
| مانگ | ڕۆژەکان | مانگ | ڕۆژەکان |
| کانوونی دووەم | ٣١ | تەمووز | ٣١ |
| شوبات | ٢٨ یان ٢٩ | ئاب | ٣١ |
| ئادار | ٣١ | ئەیلول | ٣٠ |
| نیسان | ٣٠ | تشرینی یەکەم | ٣١ |
| مایس | ٣١ | تشرینی دووەم | ٣٠ |
| حوزەیران | ٣٠ | کانوونی یەکەم | ٣١ |

### نموونە

مەلبەندێکی بازرگانی لە ٢١ ی ئادار تاوەکو ١٧ مایس دەرگاکانی دادەخات. ئەو مەلبەندە چەند ڕۆژ دەرگاکانی دادەخات؟

١١ بیربکەوە : مانگی ئادار ٣١ ڕۆژە لە ٢١ مانگەوە تاوەکو ٣١ مانگ ١١ ڕۆژە.

٣٠ + لە مانگی نیسان کە ٣٠ ڕۆژە.

١٧ + لە ١ مایس تاوەکو ١٧ مایس دەکاتە ١٧ ڕۆژ.

٥٨ کەواتە ئەو مەلبەندە ماوەی ٥٨ ڕۆژ دەرگاکانی دادەخات.

### ساغبکەوە

مانگی کانوونی دووەم یەکەم مانگی سالی زایینیە.

١ ناوی مانگی حەوتەم چییە؟ ٢ ناوی مانگی دەیەم چییە؟ ٣ ڕیزبەتی مانگی‌مایس کامەیە؟

٤ سەرجەمی ژمارەی ڕۆژەکانی نیسان و مایس و حوزەیران چەندە؟

٥ لە دەستپێکی مانگی حوزەیران تاوەکو١٥ مانگی تشرینی یەکەم ژمارەی ڕۆژەکان چەندە؟

٦ ناوی مانگی یانزە چییە؟ ٧ ناوی مانگی پێنجەم چییە؟ ٨ ناوی مانگی کۆتایی چییە؟

٩ شوبات چەندەمین مانگە؟ ١٠ ئەیلول چەندەمین مانگە؟ ١١ حوزەیران چەندەمین مانگە؟

بە ڕۆژەکان ئەژمێری ئەم کاتەنە بکە.

١٢ لە یەکەم ڕۆژی ئادار تاوەکو بەیانی یەکەم ڕۆژی حوزەیران

١٣ لە بەیانی ٧ نیسان تاوەکو بەیانی ٢٥ی حوزەیران

١٤ لە ئێوارەی ٢٨ ی ئاب تاوەکو ئێوارەی ٧ تشرینی دووەم.




**خشتەی بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانی ١٥ تا ١٩.**
**ژمارەی ڕۆژەکان لە مانگی شوباتی ساڵی ٢٠١١ زاینی ٢٨ ڕۆژە.**

١٥ ماوەی نێوان ١٥ ئەیلولی ٢٠١٠ تاوەکو ١٥ مایسی ٢٠١١ بە مانگ چەندە؟

١٦ لە دەستپێکی تشرینی دووەم ٢٠١٠تاوەکو شوباتی ٢٠١١ چەند ڕۆژە؟

١٧ چەند ڕۆژ هەیە لە بەیانی ١٦ تشرینی یەکەمی ٢٠١١ تا بەیانی ٢٨ کانوونی یەکەمی هەمان ساڵ؟

١٨ وەرزی بەهار لە ٢١ ئادار دەست پێدەکات و لە ٢٠ حوزەیرانی هەمووساڵێك کۆتایی دێت. ژمارەی ڕۆژەکانی ئەم وەرزە کامەیە؟

١٩ دلێر لە دروستکردنی خانویەکدا لە ١٣ تەمووز تاوەکوو ٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠١١ کاری کرد. ژمارەی ڕۆژەکانی پشووی لەم ماوەیەدا ١٢ ڕۆژ بوو، لەم ماوەیەشدا دلێر ٤ ڕۆژ مۆڵەتی نەخۆشی وەرگرت. ئایا دلێر لە هەموو ئەم ماوەیەدا چەند ڕۆژ کاری کردووە؟

٢٠ **هەڵەکە لەکوێدایە؟** دڵشاد ماوەی نێوان ١٥ تەمووز تاوەکو ١٥ تشرینی دووەمی هەمان ساڵی ژمارد، بینی کە ١٢٠ ڕۆژە. هەڵەی دڵشاد لەکوێدایە؟ وەڵامی ڕاست بنووسە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

ژمارەکان لە گەورەوە بۆ بچووك ریزبکە.

٢١ ٥٦ ٩٣٧ ٤٦٥ ، ٥ ٦٧٩ ٦٥٤ ، ٥٦ ٣٩٧ ٤٥٦

٢٢ حەوت سەد و چل و پێنج هەزار و سێ سەد بۆنزیکترین دە هەزار نزیك بکەوە.

٢٣ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) کام لەم ژمارانە بچووکترە لە ١٣ ٤٣٢؟

أ ١٣ ٤٢٣ ج ١٣ ٦٢٣

ب ١٣ ٥٠١ د ١٣ ٧٣٢

# پێداچوونەوە
# Review

## دڵنیا بوون لە زاراوەکان و چەمکەکان Check Vocabulary and Concepts

| |
|---|
| مانگەکانی زایینی Gregorian Months |
| مانگەکانی کۆچی immigration Months |
| پ.ن A.M (Antemeridiem) |
| د.ن P.M (Antemeridiem) |
| مۆد «المنوال» Mode |

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

١ ـــ؟ـــ ئەو ژمارەیە یان ئەو شتەی لە ئەوانی تر زیاتر دووبارە دەبێتەوە.

٢ ـــ؟ـــ واتا پێش نیوەڕۆ.

٣ لەساڵی زایینیدا مانگەکان پێیان دەوترێت ـــ؟ـــ .

## دڵنیا بوون لە کارامەییەکان Check Skills

کاتی دیاریکراو لەسەر کاتژمێر بە دوو ڕێگای جیاواز بنووسە. لەگەڵ چرکەکان ئەگەر توانرا.

٤ 

٥ 

٦ 

کات بنووسە بەبەکارهێنانی پ.ن و د.ن.

٧ کاتی نانی نیوەڕۆ دەخۆی

٨ کاتی نوێژی ئێوارە دەکەیت

٩ کاتی دەگەیتە قوتابخانە

ماوەکە «کات» ئەژمێربکە.

١٠ سەرەتا : ٨:٢٢ پ.ن
کۆتایی : ٥:٠٩ د.ن

١١ سەرەتا : ٣:١٨ د.ن
کۆتایی : ١١:٥٩ د.ن

١٢ سەرەتا : ٨:٤٣ د.ن
کۆتایی : ٣:٣٣ پ.ن

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان Check Problem Solving

بەڕێز ئەردەلان ژمارەی مێوانەکانی لە ماوەی ٧ مانگدا ئامار کرد
وە لە خشتەیەکدا ڕیزی کرد.

| مانگ | ژمارەی مێوان |
|---|---|
| شوبات | ٣١٥ |
| ئادار | ٥٢٠ |
| نیسان | ٤١٢ |
| مایس | ٤٨٣ |
| حوزەیران | ٥٢٠ |
| تەمووز | ٦٦٠ |
| ئاب | ٨٣٠ |

١٣ ژمارەی ئەو مانگانەی کە لە خشتەکەدا نەهاتووە چەندە؟

١٤ مۆد لەم کۆمەڵەیەدا چییە؟

١٥ ژمارەی مێوانەکان بۆ سەدان نزیك بکەوە، هێڵێکی ڕوونکردنەوەیی بکێشە بە دەستپێکردن لە خشتە نوێیەکە.

١٦ بەڕێز ئەردەلان وای پێشبینی کرد کە ژمارەی مێوانەکان بەردەوام لە ماوەی حەوت مانگەکە لە زیادبوون دایە. ئایا پێشبینیەکەی ڕاست دەرچوو؟ شرۆڤە بکە.

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## Standardized Test Prep

**ئاگاداربە! Tip!**

- هەموو ووردەکارییەکان بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت بۆ پرسیار.
- وەڵامەکەت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانی ١ تا ٧.**

**١** کام ڕستەی ژمارەیی دروستە؟

أ ٤٣٩ ٧١٨ > ٤٨٣ ٢٠٧

ب ٤١٨ ٦٠٣ < ٤١٦ ٠٦٣

ج ٤٣٩ ٧١٨ > ٤٢٥ ٥٩٦

د ٤٣٧ ٨٠٦ > ٤٣٨ ٧٠٦

**٢**




کام ڕستە ڕاستە؟

أ شەممە ساردترە لە پێنج شەممە

ب چوارشەممە گەرمترە لە سێ شەممە

ج هەینی ساردترە لە دووشەممە

د یەکشەممە گەرمترین ڕۆژە

**٣**

٣٢ ٤٥٦
٢٦ ٨١٢ -

أ ٦ ٦٤٤ ب ٥ ٦٤٤ ج ٥ ٤٤٤ د جگە لەمانە

**٤** کات چەندە؟




أ نۆ و دە خولەك

ب نۆ کەم دە خولەك

ج دە کەم چارێك

د هەشت کەم دە خولەك

**خشتە بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانەکانی ٥ و ٦ .**

| بەرنامەی گەشتی دکتۆر بارام | |
|---|---|
| لە سلێمانی<br>بۆ قەلادزێ | دەرچوون ٨:٠٠ پ.ن<br>گەیشتن ١١:١٠ پ.ن |
| لە قەلادزێ<br>بۆ هەولێر | دەرچوون ٢:٣٠ د.ن<br>گەیشتن ٥:٣٠ د.ن |

**٥** ماوەی نێوان سلێمانی و قەلادزێ چەندە؟

أ ٣ ك و ٢٠ خ ج ٢ ك و ١٠ خ

ب ٣ ك ٣٠ خ د ٣ ك و ١٠ خ

**٦** دکتۆر بارام ماوەی نێوان دوو گەشت چەند چاوەڕوان دەکات؟

أ ٣ ك و ٢٠ خ ج ٣ ك و ٤٠ خ

ب ٤ ك ٢٠ خ د ٥٥ خ

**٧** ناوەڕاستەی کۆمەڵەکە کامەیە؟

١٦، ١٣، ١٨، ١٤، ١٩، ١٨، ١٤، ١٨، ١٣، ؟

أ ٩ ب ١٦ ج ١٨ د ١٩

## ئەوەی دەیزانی بینووسە Write What You Know

**٨** زانیارییەکانی پرسیاری ٧ بەکاربهێنە. مۆد دیاربکە، پاشان دوو ژمارە بۆ کۆمەڵەکە زیادبکە و مۆدی نوێ بنووسە وە باس بکە.

**٩** هەریەك لە مانگەکانی نیسان و حوزەیران ٣٠ ڕۆژن، وە مانگی مایس ٣١ ڕۆژە. لە ئێوارەی ١٤ نیسان تا کۆتایی ئێوارەی دوا ڕۆژی مانگی حوزەیران چەند ڕۆژە؟ باس بکە.

بەشی ٤

# لێكدان لە ژمارەیەكی یەك ڕەنووسی

## Multiply by 1-Digit Number



لە چركەیەكدا نزیكەی ١٠٠
ڕووناكی هەورەتریشقە
لەسەر ڕووی زەوی دەدات.
ڕووناكی هەر هەورە
تریشقەیەك گرمەیەكی
لەگەڵە پاش چەند چركەیەك
گوێ هەستی پێ دەكات.

**شیكاری پرسیارەكان**

بخەملێنە چەندجار ڕووناكی
هەورەتریشقە لە ڕووی زەوی
دەدات لە كاتژمێرێك وە
هەروەها لە ڕۆژێكدا.

# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know

ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

## زاراوەکان Vocabulary

| |
|---|
| ئەنجامی لێکدان<br>Product |
| ئەنجامی دابەشکردن<br>Quotient |
| جێبەجێکردنی لێکدان<br>Multiplication procedure |

لە لیستەکەدا دەستەواژەی گونجاو هەڵبژێرە.

١ لە کرداری لێکدان وەڵام بریتییە لە ___؟___ .

٢ ژمارە ٥ لە ڕستەی ٢٠ ÷ ٤ = ٥ بریتییە لە ___؟___ .

## ڕاستییەکانی لێکدان و دابەشکردن Division and Multiplication Facts

ئەنجامی لێکدان یان ئەنجامی دابەشکردن ئەژمێربکە.

٣ ٩ × ٦ ٤ ٨ × ٤ ٥ ٦ × ٥

٦ ٧ ÷ ٤٩ ٧ ٧ ÷ ٦٣ ٨ ٥ ÷ ٤٥

## مانای کرداری لێکدان Meaning of Multiplication

ڕیزکراوەکە بەکاربهێنە بۆ ئەوەی ئەنجامی لێکدان بدۆزیتەوە.

٩

٦ × ٣

١٠

٥ × ٣

١١

٤ × ٣

١٢

٤ × ٢

١٣

٧ × ٢

١٤

٦ × ٢

## مانای کرداری دابەشکردن Meaning of Division

١٥


ژمارەی هەموو ئەستێرەکان چەندە؟
ژمارەی کۆمەڵەکان چەندە؟
ژمارەی ئەستێرەکان لە هەر کۆمەڵەیەکدا چەندە؟

١٦


ژمارەی هەموو گوڵەکان چەندە؟
ژمارەی کۆمەڵەکان چەندە؟
ژمارەی گوڵەکان لە هەر کۆمەڵەیەکدا چەندە؟

# لێکدان و دابەشکردن

## Multiplication and Division

### پێداچوونەوەی خێرا

ئەژمێربکە.

١ ٦ × ٢    ٢ ٣ × ٤

٣ ٤ × ٤    ٤ ٢ × ٨

٥ ٤ × ٥

### زاراوەکان

**دوو کرداری پێچەوانە**

2 inverse operations

**ڕاستییە پێکەوە بەستراوەکان**

Facts family



### فێربـــــه

ئارام ٦ کۆپلەی مۆسیقای لەسەر بوق ژەنی لە میانەی ئاهەنگێکی مۆسیقادا. ئەگەر ماوەی هەر کۆپلەیەك ٣ خولەك بێت.

ئەو ماوەیە چەندە کە ئارام مۆسیقای تیادا ژەنیوە؟

دەتوانی لێکبدەی: ٦ × ٣

١٨ = ٣ × ٦

کەواتە ئارام ١٨ خولەك مۆسیقای ژەنیوە.

ئارام لە ماوەی ١٨ خولەکدا لەسەر بوق لە ئاهەنگێکی قوتابخانە مۆسیقای ژەنی ئەگەر ماوەی هەر کۆپلەیەك ٣ خولەك بێت. ژمارەی کۆپلەکان چەندە؟

دەتوانی دابەشبکەی: ١٨ ÷ ٣

٦ × ٣ = ١٨
↓ ↓ ↓
کۆلکە کۆلکە ئەنجامی لێکدان

١٨ ÷ ٣ = ٦
↓ ↓ ↓
بەشکراو بەشدراو ئەنجامی دابەشکردن

کەواتە، ئارام ٦ کۆپلەی ژەنیوە.

**بیرت نەچێت** لێکدان و دابەشکردن **دوو کرداری پێچەوانەی یەکترن.**
هەر کردارێك ئەوی تریان پوچەڵ دەکاتەوە.

**ڕاستییە پێکەوە بەستراوەکان** بریتییە لە کۆمەڵە ڕستەیەکی ژمارەییە کە بەندن بە هەردوو کرداری دابەشکردن و لێکدان، وە هەمان ژمارە لەخۆدەگرێ.

| | | |
|---|---|---|
| ١٨ = ٣ × ٦ | ٦ = ٣ ÷ ١٨ | ڕاستییە پێکەوە بەستراوەکانن |
| ١٨ = ٦ × ٣ | ٣ = ٦ ÷ ١٨ | ژمارەکان ٣ و ٦ و ١٨ لەخۆ دەگرن |

### ساغبکەوە

١ ڕستەیەکی لێکدان بنووسە کە دەتوانرێت بەکاربێت بۆ ئەژمێرکردنی ٢٤ ÷ ٤.

ڕاستی لێکدان یان دابەشکردن تەواو بکە. ڕاستییەکی پێکەوە بەستراوی دابەشکردن یان لێکدان بنووسە

**٢** ٢ × ٤ = ■ **٣** ١٢ ÷ ٣ = ■ **٤** ٢٨ ÷ ٤ = ■

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**تەواوبکە. پاشان ڕستەیەکی لێکدان یان دابەشکردنی پێکەوە بەستراو بنووسە.**

**٥** ١٦ ÷ ٢ = ■ **٦** ٢٠ ÷ ٤ = ■ **٧** ٣ × ٤ = ■

**٨** ٦ × ٣ = ■ **٩** ٦ × ٥ = ■ **١٠** ٣٦ ÷ ٤ = ■

**ڕاستییەکانی پێکەوە بەستراو بۆ هەر کۆمەڵەیەك لەم ژمارانەدا بنووسە.**

**١١** ٢، ٣، ٦. **١٢** ٤، ٧، ٢٨ **١٣** ٣، ٧، ٢١

**١٤** ئایا دەتوانی چەند ژمارەیەك بهێنی دوو ڕاستی پێکەوە بەستراوی لێکدان بەدەست بهێنێت.

**بەکارهێنانی پێدراوەکان ئەم خشتەیە بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانەکانی لە ١٥ تا ١٧.**

**١٥** کارزان لە ماوەی ٣ مانگدا کارتەکانی یاری سەبەتەی کۆکردەوە کە ٤٤ کارت لە مانگی یەکەم و ٢٩ کارت لە مانگی دووەم. کارزان لە مانگی سێیەم چەند کارتی کۆکردەوە؟



| کۆمەڵەی کارتەکانی کارزان | |
|---|---|
| وەرزش | ژمارە |
| تۆپی سەبەتە | ١١٠ |
| تۆپی پێ | ٢٨ |
| تۆپی تێنس | ٣٥ |
| تۆپی تێنسی سەر زەوی | ٦٤ |

**١٦** کارزان لەماوەی ٤ هەفتەدا هەمان ژمارەی کارتەکانی تۆپی پێی کۆکردەوە لە هەر هەفتەیەك. ئایا چەند کارتی کۆکردەوە لە یەك هەفتەدا؟

**١٧** ژمارەی گشتی کارتەکانی کارزان کە کۆی کردەوە چەندە؟

**١٨** **بنووسە** چۆن کرداری لێکدان بەکاردەهێنی بۆ شیکار کردنی پرسیارەکانی دابەشکردن. شرۆڤە بکە و نموونەیەکی لەسەر بهێنەوە

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**سەرجەم یان جیاوازی ئەژمێربکە.**

**١٩**
٣ ٥٤٢
١ ٨٦٩
+٥ ٣٧٢

**٢٠**
٨ ٦٠٠
−٤ ٢٣٧

**٢١**
٣ ١٨٩
−٢ ٨٨٤

**٢٢**
٢ ٥٠٩
١ ٤٨٧
+٤ ٣٧٥

**٢٣** شێوەی ڕەنووسی بۆ ژمارە حەوت سەد و پێنج چییە؟

أ ٧٥ ب ٧٠٥ ج ٧٠٠٥ د ٧٥٠٠



**پێداچوونەوەی خێرا**

ئەژمێر بکە.

1. ٦ × ٢
2. ١٢ ÷ ٢
3. ٥ × ٣
4. ١٥ ÷ ٣
5. ٦ ÷ ٣



# لێکدان و دابەشکردن تا ٥

# Multiply and Divide Facts Through 5

## فێربـــــــە

مامۆستا کامەران داوای لە قوتابییەکانی کرد کە نموونەکان بەکاربهێنن بۆ دەرخستنی دابەشکردن وەك کردارێکی پێچەوانەی لێکدان. ئەم نموونانەی خوارەوەی دەست کەوت.

**هیوا**



١٥ = ٥ × ٣



٥ = ٣ ÷ ١٥

٣ کۆمەڵەم پێکهێنا هەریە کەیان لە ٥ دەنك شقارتە، ١٥ دەنکم بەدەست هێنا. پاشان ١٥ دەنکم بەشیەوە بە ٣ کۆمەڵەدا لە هەر کۆمەڵەیەك ٥ دانەم دەست کەوت

**محەمەد**




٩ = ٣ × ٣




٣ = ٣ ÷ ٩

لە سفرەوە دەستم پێکرد وە بازم دا سێ سێ لەسەر هێڵی ژمارەکان گەیشتمە ٩، وە لە ٩ دەستم پێکرد بازم دا سێ سێ بەرەو پاش تا گەیشتم بە سفر.

**کلارا**



٢٠ = ٤ × ٥



٥ = ٤ ÷ ٢٠

وێنەی ٥ ڕیز لە ٤ چوارگۆشەم دروستکرد ٢٠ چوارگۆشەم دەستکەوت. پاشان ٢٠ چوارگۆشەم دابەشکرد سەر ٤ ستوون ، ٥ چوارگۆشەم لە هەر ستونێك دەستکەوت

**شیلان**

خشتەی لێکدانم وەرگرت بۆ ئەوەی ٦ × ٤ لێکبدەم. بە ئاسۆیی سەیرم کرد لە میانەی ڕیزی ٦ بە دابەزین لە ستوونی ٤، لە شوێنی یەکتر بڕینییان ئەنجامی لێکدانم دۆزیەوە کە ٢٤. بۆ ئەوەی ٢٤ ÷ ٤ دابەش بکەم شوێنی ٢٤م دیارکرد لە ئەستونی ٤ پاشان سەیری لای ڕاستم کرد بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی دابەشکردنی ٦.

٢٤ = ٤ × ٦

کەواتە ٦ = ٤ ÷ ٢٤

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ | ١٨ |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | ٢١ | ٢٤ | ٢٧ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٨ | ٣٢ | ٣٦ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ |
| ٦ | ٠ | ٦ | ١٢ | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ | ٤٢ | ٤٨ | ٥٤ |

## ساغبکەوە

1. نموونەیەك بکێشە کە کرداری پێچەوانە بۆ کرداری لێکدانی ٥ × ٦ = ■ دیاردەکات. پاشان کرداری پێچەوانە بنووسە.

ڕاستییە پێکەوە بەستراوەکانی لێکدان یان دابەشکردن بنووسە.

٢ ١٠ ÷ ٢ = ٥




٣ ٤ × ٤ = ١٦




٤ ٤ × ٣ = ١٢



## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

ڕاستییەکی پێکەوە بەستراوەی لێکدان یان دابەشکردن لەگەڵ هەریەکە لەم ڕاستییانە بنووسە.

٥ ٦ × ٢ = ١٢



٦ ٢ × ٣ = ٦



٧ ٤ × ٢ = ٨




ئەنجامی لێکدان یان ئەنجامی دابەشکردن ئەژمێریکە.

٨ ١٤ ÷ ٢    ٩ ٥ × ٥    ١٠ ٥ × ٧

١١ ٨ × ٤    ١٢ ٣٦ ÷ ٤    ١٣ ٣ × ٠

تەواو بکە .

١٤ ٤ × ٢ = ٨ ، کەواتە ٤ × ٢ × ٢ = ■

١٥ ٥ × ٥ = ٢٥ ، کەواتە ( ٥ × ٥ ) + ١٠ = ■

١٦ ٤٥ ÷ ٥ = ٩ ، کەواتە ( ٤٥ ÷ ٥ ) × ٢ = ■

١٧ ٣ × ٤ = ١٢ ، کەواتە ٣ × ٤ × ٢ = ■

١٨ سامی ئوتومبیلێکی ئەلیکترۆنی هەبوو، کە جارێك دەستی دەخستە سەر دوگمەیەك، ئوتومبیلەکەی دوو هەنگاو بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت لە ماوەی خولەکێك. ئەگەر سامی دوو جار دەستی خستە سەر دوگمەکە ئەوا ئوتومبێلەکەی چەند هەنگاو بەرەو پێش دەچێت؟



١٩ پرسیارێك بنووسە کە دابەشکردنی تێدا بەکاربهێنی وە دەتوانرێ شیکاربکرێت بەبەکارهێنانی ڕاستی لێکدانی ٧ × ٥ = ٣٥.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

٢٠ ١ ٢٣٤ + ٣٤٥

٢١ ١٤ ٨٤٢ بۆ نزیکترین هەزار نزیك بکەوە.

٢٢ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە خەرمان بایی ٣ هەزار دینار کاهووی کڕی و بایی ٤ هەزار دینار پیازی کڕی و بایی ٦ هەزار دینار تەماتەی کڕی. ئەگەر ٢٥ هەزار دینار بدات بە خاوەن دوکانەکە چەندی بۆ دەگەڕێنێتەوە؟

أ ١٣ هەزار دینار    ب ١٢ هەزار دینار    ج ١٨هەزار دینار    د ١٥ هەزار دینار

## پێداچوونەوەی خێرا

ئەژمێربکە.

١ ٥ × ٦     ٢ ٣٠ ÷ ٦

٣ ٥ × ٣     ٤ ٧ × ٣

٥ ٢٥ ÷ ٥

وانەی ٣

# لێکدان و دابەشکردن تا ١٢

# Multiply and Divide Facts Through 12

## فێربە

**بەش بەش بکە و سوود وەربگرە** دەتوانی ژمارەکان بەش بەش بکەی بۆ ئەوەی کرداری لێکدان ئاسانتر بێت.

٦ لە ٨ بدە.



### نموونە

بەدەست

کەرستەکان : کاغەزی چوارگۆشەکان

ئەنجامی لێکدانی ٦ × ٨ چەندە؟

**هەنگاوی ١**

لاکێشەیەك دروست بکە دووریەکانی ٦ و ٨ بێ.




**هەنگاوی ٢**

لاکێشەیەك ببڕە بۆ دوو بەش، ئەنجامی لێکدانی هەر بەشێکیان بزانە .




کۆڵکەی ٨ بەش بەشت کرد بۆ ٤ + ٤

**هەنگاوی ٣**

سەرجەمی ئەنجامی هەر دوو لێکدان ئەژمێر بکە.

٦ × ٤ = ٢٤

٦ × ٤ = ٢٤

٢٤ + ٢٤ = ٤٨

کەواتە، ٦ × ٨ = ٤٨

## ساغبکەوە

کاغەزی چوارگۆشەکان بەکاربهێنە، یەکێك لە کۆڵکەکان بەش بەش بکە بۆ ئەژمێرکردنی ئەنجامی لێکدان.

١ ٧ × ٦     ٢ ٨ × ١٠     ٣ ٦ × ٩

ئەنجامی لێکدان یان ئەنجامی دابەشکردن ئەژمێر بکە.

٤ ٩ × ٦     ٥ ٧ × ٨     ٦ ٤٨ ÷ ٦     ٧ ٣٦ ÷ ٩

٨ **هەڵەکە لەکوێدایە؟** سامان ڕێگەی بەش بەش کردنی بەکارهێنا بۆ ئەژمێری ٨ × ٩ ، سامان لەکوێ هەڵەی کردووە؟ شێوەی ڕاست دیار بکە بۆ بەکارهێنانی ئەم ڕێگایە.

٨ × ٣ = ٢٤

٢٤ + ٢٤ = ٤٨

کەواتە ٨ × ٩ = ٧٢

| × | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| ١ | ٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ |
| ٢ | ٠ | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ | ١٤ | ١٦ | ١٨ | ٢٠ | | |
| ٣ | ٠ | ٣ | ٦ | ٩ | ١٢ | ١٥ | ١٨ | ٢١ | ٢٤ | ٢٧ | ٣٠ | ٣٣ | ٣٦ |
| ٤ | ٠ | ٤ | ٨ | ١٢ | ١٦ | ٢٠ | ٢٤ | ٢٨ | ٣٢ | ٣٦ | ٤٠ | ٤٤ | ٤٨ |
| ٥ | ٠ | ٥ | ١٠ | ١٥ | ٢٠ | ٢٥ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٥ | ٥٠ | | |
| ٦ | ٠ | ٦ | ١٢ | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ | ٤٢ | ٤٨ | ٥٤ | ٦٠ | ٦٦ | ٧٢ |
| ٧ | ٠ | ٧ | ١٤ | ٢١ | ٢٨ | ٣٥ | ٤٢ | ٤٩ | ٥٦ | ٦٣ | ٧٠ | | ٨٤ |
| ٨ | ٠ | ٨ | ١٦ | ٢٤ | ٣٢ | ٤٠ | ٤٨ | ٥٦ | ٦٤ | ٧٢ | ٨٠ | ٨٨ | ٩٦ |
| ٩ | ٠ | ٩ | ١٨ | ٢٧ | ٣٦ | ٤٥ | ٥٤ | ٦٣ | ٧٢ | ٨١ | ٩٠ | ٩٩ | |
| ١٠ | ٠ | ١٠ | ٢٠ | ٣٠ | ٤٠ | ٥٠ | ٦٠ | ٧٠ | ٨٠ | ٩٠ | ١٠٠ | ١١٠ | ١٢٠ |

**ڕێگای بەش بەش بوون بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان، پاشان خشتەی لێکدان تەواو بکە.**

٩ ١١ × ٢     ١٠ ١٢ × ٢

١١ ١١ × ٥     ١٢ ١٢ × ٥

**خشتەی لێکدان بەکاربهێنە بۆ ئەژمێرکردنی ئەنجامی لێکدان.**

١٣ ٤ × ٢     ١٤ ٣ × ١١     ١٥ ٤ × ١٠

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**خشتەی لێکدان بەکاربهێنە بۆ ئەژمێرکردنی ئەنجامی لێکدان یان ئەنجامی دابەشکردن.**

١٦ ٥ × ١٠     ١٧ ٤ × ١٢     ١٨ ١١٠ ÷ ١١

١٩ ٩ × ٥     ٢٠ ٩٠ ÷ ١٠     ٢١ ٤٨ ÷ ٦

**تەواو بکە.**

٢٢ ■ × ١٢ = ١٢٠     ٢٣ ١١ × ■ = ٨٨     ٢٤ ١٠٠ ÷ ■ = ١٠

٢٥ **دەرئەنجام** ڕێگایەکی هزری باسبکە بۆ جێبەجێکردنی کردارەکانی دابەشکردنی ئەمانەی خوارەوە:
٧٧ ÷ ١١؛ ٨٨ ÷ ١١؛ ١٢١ ÷ ١١؛ ١٣٢ ÷ ١١

٢٦ ڕەمزی ویستی ١٠٨ سێو لێبکاتەوە، تائێستا ٥ کارتۆنی لێکردۆتەوە. چەند کارتۆن پێویستە لێبکاتەوە ئەگەر هەر کارتۆنێك ١٢ سێوی تێدابێت؟

٢٧ نموونەیەك یان ڕێگایەك بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدانی ١٤ × ١٢. باسبکە.

٢٨ **پرسیار چییە؟** وەڵام بریتییە لە : یەکێك لە کۆڵکەکانی ١١و ئەنجامی لێکدان ١٣٢.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

بەهای برەکە لە هەردوو ڕاهێنانی ٢٩ و ٣٠ ئەژمێربکە.

٢٩ (١٥ − ٩) + ٣     ٣٠ (٢٧ + ٢) + ١٢

٣١ شێوەی ڕەنووسی بۆ ژمارە سێ سەد و حەفتا و دوو هەزار چییە؟

٣٢ ماوەی نێوان ١١:٣٠ پ.ن و ١:٠٥ د.ن چەندە؟

٣٣ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە کارزان ١٢ پێنووسی لابوو، ٣ پێنووسی دا بە خوشکەکەی و ٤ی دا بە براکەی. ئایا چەند پێنووسی لا ماوەتەوە؟

أ ٤     ج ٥

ب ٦     د ٧

وانەی ٤

# لێکدانی سێ ژمارە

# Multiply 3 Factors (numbers)

### پێداچوونەوەی خێرا

ئەژمێربکە.

1. ٣ × ٤
2. ٩ × ٩
3. ٨ × ١٠
4. ٥ × ٧
5. ٤ × ١٢

### زاراوەکان

یەکتربەستن لە لێکدان
grouping property of multiplication

## فێربە

گۆرانی بێژێك لە ئاهەنگێکدا دووجار هاتە سەر شانۆ، لە هەر جارێکیان ٤ گۆرانی پێشکەش کرد، هەر گۆرانییەك ٥ خولەکی خایاند. ماوەی گۆرانی ووتنەکەی چەند بوو لە ئاهەنگەکەدا؟
پێویستە لێکبدرێ: ٤ × ٢ × ٥
دەتوانی **یەکتربەستن** بەکاربهێنی بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.

**بەبیرت بێ**
**Remember**
یەکەم جار ناو کەوانەکە ئەژمێر بکە.

**لەبیرمەکە** یەکتربەستن لەلێکدان.
ئەگەر یەکتربەستنی کۆڵەکان بگۆریت،
ئەوا ئەنجامی لێکدان ناگۆڕێت.



### نموونە

کەوانەکان ( ) بەکاربهێنە بۆ یەکتر بەستنی ئەو کۆڵکانەی کە یەکەم جار کرداری لێکدانی لەسەر جێبەجێ دەکرێت.

| | |
|---|---|
| ( ٤ × ٢ ) × ٥ | ٤ لە ٢ بدە |
| ٨ × ٥ = ٤٠ | پاشان ئەنجام لە ٥ بدە. |
| ٤ × ( ٢ × ٥ ) | ٢ لە ٥ بدە |
| ٤ × ١٠ = ٤٠ | پاشان ئەنجام لە ٤ بدە |

کەواتە، ماوەی ئاهەنگی گۆرانی وتن ٤٠ خولەکە.

## ساغبکەوە

1. دوو ڕێگا بڵێ بۆ بەیەکتربەستنی ٢ × ٣ × ٤ ، بۆدۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان، ئایا ئەنجامی لێکدان لە هەردوو ڕێگاکە یەکسانە؟

ئەنجامی لێکدان ئەژمێر بکە.

2. ( ٦ × ٢ ) × ٥
3. ( ٢ × ٥ ) × ٢
4. ( ٦ × ٢ ) × ٦

دوو ڕێگا بۆ بەیەکتربەستن دیاریکە بەبەکارهێنانی کەوانەکانی ( ) . ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە.

**٥** ٢ × ٣ × ٤    **٦** ٣ × ٣ × ٣    **٧** ٣ × ٢ × ٤

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە.

**٨** ١ × (٢ × ٦)    **٩** (٣ × ٣) × ٤    **١٠** (٤ × ٢) × ٩

**١١** (٥ × ٢) × ١١    **١٢** ٢ × (٤ × ٢)    **١٣** (٣ × ٤) × ٩

دوو ڕێگا بۆ بەیەکتربەستن دیاریکە بەبەکارهێنانی کەوانەکانی ( ) . ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە.

**١٤** ٣ × ٢ × ٥    **١٥** ٥ × ١ × ٩    **١٦** ٦ × ٢ × ٣

**١٧** ١٢ × ٠ × ٩    **١٨** ٣ × ٢ × ٢    **١٩** ٥ × ٢ × ٥

< یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

**٢٠** ١ × ٢ × ٣ ● ٣ × ٢ × ١    **٢١** ٥ × (٢ × ٢) ● (٥ × ٢) × ٢

**٢٢** (٢ × ٦) × ٣ ● (٣ × ٢) × ٩    **٢٣** (٢ × ٣) × ٣ ● (١ × ٣) × ١٠

**٢٤** خالید ڕۆژنامەی بەسەر ٣ لەهاوڕێکانیدا بەشیەوە بۆماوەی ٣ ڕۆژ، بۆ هەر ڕۆژنامەیەك ٢ دووسەد و پەنجا دیناری وەرگرت، بڕی ئەو پارەیەی کە خالید وەریگرت چەند دووسەد و پەنجا دینارییە؟



**٢٥** کارزان ڕاهێنانی لەسەر ژەنینی ئامێری عود دەکات بۆماوەی ٣ کاتژمێر لە هەفتەیەکدا. شوان ڕاهێنانی لەسەر ژەنین ئامێری پیانۆ دەکات بۆماوەی ٥ کاتژمێر لە هەفتەیەکدا. شوان چەند کاتژمێر زیاتر ڕاهێنان دەکات لەکارزان لە ماوەی ٤ هەفتەدا؟

### پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**٢٦** ١٠٥ + ٢٨ + ٨٢

**٢٧** ٤ ٥٦٩ + ٢ ٣٨٢ + ٤ ٣٧٥

**٢٨** ٤٣ ٢٥٩ − ١٨ ٥١٣

**٢٩** ١ ٠٠٣ − ٤٢٦

**٣٠** شۆنی ٣ چەپك گوڵی چنی و جولیێت ٧ چەپکە گوڵ، ژمارەی هەموو گوڵەکان چەند؟ بۆ زانین هەرچەپکێك ١٢ گوڵ لەخۆ دەگرێت.

أ ١٠٠    ب ١٠    ج ١٢٠    د ١٢

# ئەژمێرکردنی هزری
## شێوازەکان لە لێکدان
## Mental Math: Multiplication Patterns

**پێداچوونەوەی خێرا**

**تەواو بکە.**

١. ٣٩ + ■ = ٧ × ٦

٢. ٤ − ٢٥ = ٣ × ■

٣. ■ ÷ ٦٠ = ٢ × ٥

٤. ٢ × ١٠ = ■ × ٤

٥. ■ × ٤ = ٨ − ٣٢



### فێربە

دەتوانین ڕاستییە بنەڕەتییەکان و شێوازەکان بەکاربهێنین بۆ بەدەست هێنانی ئەنجامی لێکدان بە هزر. چۆن دەتوانی ژمارەی پەنجادیناریەکان بدۆزیتەوە کە لە ٧ بەستەدایە، هەر بەستەیەك ٥٠ پارچە لە جۆری پەنجادیناری کانزایی تێدایە؟

دەتوانیت ٧ لە ٥٠ بدەیت بۆ دۆزینەوەی سەرجەم.

| | |
|---|---|
| ٥٠ | بیریکەوە: ٥٠ = ٥ × ١٠ یان ٥ دەیی |
| ٧ × | ٧ × ٥ دەیی = ٣٥ دە |
| ٣٥٠ | ٣٥ دە = ٣٥ × ١٠ یان ٣٥٠ |

کەواتە ٣٥٠ پەنجایی هەیە.

ئەگەر ڕاستییەی بنەڕەتییەکانت ناسی. ئەوا دەتوانی ئەژمێر کردن بە هزر و شێوازەکان بەکاربهێنی بۆ لێکدانی ژمارە گەورەکان.

**نموونە**

| أ | ب | ج |
|---|---|---|
| ١٤٠ = ٢٠ × ٧ | ٤٠٠ = ٨٠ × ٥ | ٣٠ = ٥ × ٦ |
| ١٤٠٠ = ٢٠٠ × ٧ | ٤٠٠٠ = ٨٠٠ × ٥ | ٣٠٠ = ٥ × ٦٠ |
| ١٤٠٠٠ = ٢٠٠٠ × ٧ | ٤٠٠٠٠ = ٨٠٠٠ × ٥ | ٣٠٠٠ = ٥٠ × ٦٠ |
| ١٤٠٠٠٠ = ٢٠٠٠٠ × ٧ | ٤٠٠٠٠٠ = ٨٠٠٠٠ × ٥ | ٣٠٠٠٠ = ٥٠ × ٦٠٠ |

**لەبیر مەکە** هەرچەندە ژمارەی سفرەکان زیاد بکات لە هەر کۆڵکەیەك، ئەوا ژمارەی سفرەکان لە ئەنجامی لێکدان زیاددەکات.

### ساغبکەوە

١. ئەم ڕێسایە کامەیە بەکاری دەهێنیت بۆ لێکدان لە چەندجارەکانی ١٠ و ١٠٠و ١٠٠٠ و ١٠٠٠٠؟

ڕاستییە بنەڕەتییەکان و شێوازەکان بەکاربهێنە بۆ ئەژمێرکرن.

| ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
|---|---|---|---|
| أ) ٢٠ × ٣ | أ) ٤٠٠ × ٤ | أ) ٥٠ × ٨ | أ) ٩ × ٣٠ |
| ب) ٢٠٠ × ٣ | ب) ٤٠٠٠ × ٤ | ب) ٥٠ × ٨٠ | ب) ٩٠ × ٣٠٠ |
| ج) ٢٠٠٠ × ٣ | ج) ٤٠٠٠٠ × ٤ | ج) ٥٠ × ٨٠٠ | ج) ٩٠٠٠ × ٣٠٠ |

ڕاستییە بنەرتییەکان و شێوازەکان بەکاربهێنە تا ئەژمێری بکەی.

٦ 
٧٠ × ٤
٧٠٠ × ٤٠
٧٠٠٠ × ٤٠

٧ 
١٠ × ٢٠
١٠٠ × ٢٠
١٠٠٠ × ٢٠

٨ 
١٠ × ١٢
١٠٠ × ١٢
١٠٠٠ × ١٢

٩ 
٣ × ٢٤
٣٠ × ٢٤
٣٠٠ × ٢٤

ئەژمێربکە.

١٠ ١٤ × ١٠

١١ ١٦ × ٢٠

١٢ ٣٤ × ٤٠

١٣ ٢٧ × ٣٠

تەواو بکە.

١٤ ■ = ٤٠٠٠ × ٥

١٥ ٣٠٠٠ × ٢ = ■

١٦ ٢٧٠٠ = ■ × ٣

١٧ ٧٢٠٠ = ٨٠٠ × ■

ڕەنووسی نادیار بنووسە.

١٨ ٤٠٠ = ٤٠ × ■٠

١٩ ٦٠٠ = ■٠ × ٢٠

٢٠ ٦٨٠ = ٤٠ × ■٧

٢١ لە پشووی هاویندا، مامۆستا شنۆ ئوتۆمبیلەکەی بە خێرای ٨٠کم لە کاتژمێرێکدا بۆ ماوەی ٤ کاتژمێر لێدەخوڕی، ئایا ئەو ماوەیەی لە ٦ ڕۆژدا بڕیویەتی چەندە؟

٢٢ وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان ویستی ٥ هۆڵ لە شاری هەولێر دروست بکات کە هەر هۆڵێك ٥٠٠ کورسی تێدا بێت، وە قوتابخانەیەکی ١٢ پۆلی دروست بکات کە هەر پۆلی ٣٠ قوتابی بگرێت. ئایا چەند کورسی پێویستە بۆ پڕکردنەوەی هۆڵەکان و پۆلەکان؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

٢٣ ٥ × ٢ × ٨

٢٤ ١٢ × ١٢

٢٥ وانەی وەرزش کاتژمێرێك و ٥٠ خولەك دەخایەنێت، وانەکە ١١:٤٠پ.ن دەست پێدەکات، لە چ کاتێك کۆتایی دێت؟

٢٦ بەهای ڕەنووسی ٧ لە ژمارە ٧ ٢٢٤ ٩٨٠ کامەیە؟

< یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

٢٧ ٧٥ ٨١٢ − ٨٠ ٧٠٠ ● ١٠ ٨٢٠ − ١٥ ٩٧٠

٢٨ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە ناوەڕاستەی کۆمەڵەی ٢ ، ٣ ، ٢ ، ٦ ، ٥ چییە؟

أ ٢ ج ٤

ب ٣ د ٥



## پێداچوونەوەی خێرا

بیدۆزەوە.

1. ٦ × (٣ × ٤)
2. ٢ × (٣ + ٢)
3. (٤ × ٥) × ١٠
4. (٤ + ٢) × ١٠
5. (٣ × ١٠) + ١٢

وانەی ٦

# جێبەجێکردنی لێکدان

# Multiply 3- digit Numbers

## فێربە

سەعید کارتەکانی جۆری خواردنی بۆ دایکی کۆکردەوە لە دوو پاکەتدا، هەر پاکەتێك ١٥٦ کارتی تێدابوو، ژمارەی ئەو کارتانەی کە سەعید کۆی کردۆتەوە چەندە؟

### نموونە

دەتوانی ٢ × ١٥٦ ئەنجام بدەیت بۆ ئەژمێری ژمارەی کارتەکان.

**ڕێگای یەکەم** نموونەکان بەکاربهێنە بۆ ئەژمێرکردنی ئەنجامی لێکدان.

**هەنگاوی ١**

یەکان لێکبدە

٢ × ٦ = ١٢

١٢ دابنێ بەشێوەی ده و ٢.



```
  ١
 ١٥٦
  ٢×
-----
   ٢
```

**هەنگاوی ٢**

دەیان لێکبدە

٢ × ٥ = ١٠ دەیی

ئەو دەیەی کۆکراوەتەوە بخە سەر،

١٠ دەیی + ده = ١١ دەیی

١١ دەیی دابنێ بەشێوەی ١ سەدی و ١ ده



```
 ١١
 ١٥٦
  ٢×
-----
  ١٢
```

**هەنگاوی ٣**

سەدان لێکبدە

٢ × سەد = دوو سەد

ئەو سەدەی کۆکراوەتەوە بخە سەر

دووسەدیی + سەد = ٣ سەدی



```
 ١١
 ١٥٦
  ٢×
-----
 ٣١٢
```

کەواتە، سەعید ٣١٢ کارتی کۆکردەوە.

**ڕێگای دووەم** شێوەی درێژی بەکاربهێنە بۆ ئەژمێرکردنی ئەنجامی لێکدان.

٤ لە ٣٦٨ بدە     ٤ × ٣٦٨ = ■

بیربکەوە : ٣٦٨ = ٨ + ٦٠ + ٣٠٠ شێوەی درێژییە.

٤ لە هەریەکە لە کۆڵکەی کۆکردنەوەکە بدە پاشان کۆی بکەوە.

٤ × ٨   ٤ × ٦٠   ٤ × ٣٠٠

بنووسە   ٣٢ + ٢٤٠ + ١٢٠٠ = ١٤٧٢



## ساغبکەوە

1. باس بکە چۆن شێوەی درێژی بەکاردەهێنی بۆ ئەژمێرکردنی ٦ × ٢٧٤ ؟

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

لێکبدە.

**٢** ٢٤١ × ٢

**٣** ٦٣٢ × ٤

**٤** ٣٦ × ٢

**٥** ٨٥٢ × ٢

**٦** ٦٢ × ٩

**٧** ٨٤ × ٥

لێکبدە پاشان کۆبکەوە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی لێکدان.

**٨** ٤٧٢ × ٣

(٤٠٠ × ٣) + (٧٠ × ٣) + (٢ × ٣)

↓ ↓ ↓

■ + ■ + ■ = ■

**٩** ٦٤٧ × ٥

(٦٠٠ × ٥) + (٤٠ × ٥) + (٧ × ٥)

↓ ↓ ↓

■ + ■ + ■ = ■

بەراوردبکە. < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

**١٠** ٣٢٦ × ٤ ● ٤٦٧ × ٣

**١١** ٤٥ × ٣ ● ٢٧ × ٦

**١٢** ٥٨ × ٩ ● ٩٨ × ٥

**١٣** ٧٤٢ × ٤ ● ٣٦٩ × ٨

**١٤** جوان دەڵێ ٥ × ٣٦ یەکسانە بە ٢ × ٩٠ ئایا تۆ لەگەڵ ڕای ئەویت؟ شرۆڤە بکە.

**١٥** لە ئاهەنگێکی خێزانیدا هاوکار ٢٨ پاکەت چوکلێتی دابەشکرد کە لە هەر پاکەتێکدا ٦ دانە چوکلێتی تێدابوو، هاوکار چەند دانە چوکلێتی دابەشکردووە؟

**١٦** کارگەیەك ١٢٦ کۆمپیوتەر لە ڕۆژێکدا بەرهەم دێنێت، لە ٨ ڕۆژدا چەند کۆمپیوتەر بەرهەم دێنێت؟



**١٧** لە هەفتەیەك و دوو ڕۆژدا چەند کاتژمێر هەیە؟

**١٨** لە ٦ کاتژمێردا چەند خولەك هەیە؟

### پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**١٩** ٦٨٩٩ + ٢٢٦٧

**٢٠** ٨٩٠٢ − ٥٧٣٠

**٢١** ٢ × (٣٠ + ٦) بدۆزەوە.

تەواو بکە.

**٢٢** ٢٤ + ٣٧ = ■ + ٣١

**٢٣** ■ + ٤٥ = ٤١ + ٣٧

**٢٤** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) سیروان ١٦ پوولی پۆستەی لایە، سۆران ٦ پوولی لایە، ڕامان ١٢ پوولی لایە، هەموویان چەند پوولیان هەیە؟

أ ٣٠ ب ٣٤ ج ٤٢ د ٤٦

**٢٥** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) دارڤان ٨ بەند کاغەزی کڕی، هەر بەندێك ٦٠ پەڕی تێدابوو، دارڤان چەند پەڕەی کڕیووە؟

أ ٢٤٠ ب ٣٦٠ ج ٤٢٠ د ٤٨٠

وانەی ٧

# خەملاندنی ئەنجامی لێکدان

# Estimate Products

**پێداچوونەوەی خێرا**

نزیك بکەوە بۆنزیکترین سەد.

١ ٥٧٢    ٢ ٩٢١

٣ ١ ٧٢٦    ٤ ٢ ١٣٥

٥ ٥ ٨٣٤

## فێربە

**ئارد و نان** نانەوایەك ٢٨٩ کێکی فرۆشت لە مانگی ڕابردوو.
هەر کێکێك پێویستی بە ٤ کوپ ئارد هەیە.
نانەواکە چەند کوپ ئاردی بەکارهێناوە لە مانگی ڕابردوو؟



**نموونە** بخەملێنە: ٤ × ٢٨٩

**هەنگاوی ١**

٢٨٩ نزیك بکەوە بۆ نزیکترین سەد

٢٨٩ × ٤
↓
٣٠٠ × ٤

**هەنگاوی ٢**

ڕاستییە بنەڕەتییەکان و شێوازەکان بەکاربهێنە:

**بیریکەوە** : ٤ × ٣ = ١٢

٤ × ٣٠٠ = ١ ٢٠٠

بێ سفر + ٢ سفر = ٢ سفر

کەواتە، نانەواکە نزیکەی ١ ٢٠٠ کوپ ئاردی بەکارهێناوە.

**چەند نموونەیەکی تر** ئەنجامی لێکدان بخەملێنە.

أ) ٧٣ ← ٧٠
×٤٢   ×٤٠
٢ ٨٠٠

ب) ٢٤٥ ← ٢٠٠
×٦٥   ×٧٠
١٤ ٠٠٠

**لەبیرت بێ**
**Remember**

کاتێك ژمارەیەك نزیك دەکەیتەوە

- ئەو خانەیە دیاریکە کە بۆی نزیك دەکرێتەوە. ووردبەوە لە ڕەنووسی لای ڕاست.
- ئەگەر هاتوو ڕەنووسی لای ڕاست کەمتر بوو لە ٥، ئەو ژمارەیە وازلێ بێنە لە خانەی نزیك بوونەوەدا و لە جێگای ئەو ڕەنووسانەی لای ڕاست سفر دابنێ.
- ئەگەر هاتوو ڕەنووسی لای ڕاست ٥ یان زیاتر بوو ئەوا ١ بۆ ئەو ڕەنووسەی لەو خانەیەی کە بۆی نزیك دەکرێتەوە زیاد بکە. وە سفر لە جێگای ڕەنووسەکانی لای ڕاست دابنێ.

## ساغبکەوە

١ باس بکە چۆن دەزانی کە ئەنجامی خەملێنراو گەورەترە یان بچووکترە لە ئەنجامی ڕاستەقینە.

٢ باس بکە چۆن ٥٢ × ١٦٨ دەخەملێنی.

یەك ژمارە نزیك بکەوە، ئەنجامی لێکدان بخەمڵێنە.

**٣** ١٨٣ × ٤  **٤** ٧٦٩ × ٥  **٥** ١ ١٨٩ × ٦

**٦** ٢٦ × ٨  **٧** ٣٥٩ × ٥  **٨** ١ ٧٨٩ × ٩

هەر یەك لە دوو ژمارەکە نزیك بکەوە، ئەنجامی لێکدان بخەمڵێنە.

**٩** ١٩ × ١٢  **١٠** ٢٧٨ × ٣٣  **١١** ٥٤٨ × ٤٥

**١٢** ٨٥ × ١٣  **١٣** ٢٤ × ٤٩  **١٤** ٤١٢ × ٩٠

دوو ژمارە لە لیستەکە هەڵبژێرە بۆ هەر ئەنجامێکی لێکدانی خەمڵێنراو.

**١٥** ١ ٦٠٠ = ● × ■  **١٦** ٧٠٠ = ● × ■

**١٧** ٧ ٠٠٠ = ● × ■  **١٨** ٢ ٤٠٠ = ● × ■

| ٤ | ٧ | ٣٩٢ |
|---|---|---|
| ٦ | ١٢٣ | ٩٨٩ |

خەملاندن بەکاربهێنە بۆ بەراوردکردن. < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

**١٩** ١٣٢ × ٢٠ ● ٣ ٠٠٠  **٢٠** ١٣ ٠٠٠ ● ٦٤٥ × ٢٦  **٢١** ٤٢ × ٤٩ ● ١ ٨٠٠

## بەکارهێنانی پێدراوەکان

**٢٢** ئەم خشتەیەی بەرامبەر ژمارەی سێوەکان دیاردەکات بۆقەبارەی هەر تورەگەیەك وە ژمارەی تورەگە فرۆشراوەکان، ژمارەی سێوە فرۆشراوەکان لە هەر جۆرە تورەگەیەك بخەملێنە.

| قەبارەی تورەگە | تێکرای ژمارەی سێوەکان | ژمارەی تورەگەی فرۆشراو |
|---|---|---|
| بچووك | ١١ | ٢٧ |
| ناوەندی | ١٨ | ٢١ |
| گەورە | ٢٦ | ١٢ |

**٢٣** باوکی دڵشاد ١٧٦ شوشە شەربەتی لیمۆی لە مانگی کانوونی دووەم فرۆشت، هەر شووشەیەك پێویستی بە گوشینی ١٢ لیمۆ هەیە، ژمارەی لیمۆیەکانی کە باوکی دڵشاد گوشیتی لە مانگی کانوونی دووەم بخەملێنە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**٢٤** تەواوبکە.

١٠١ ، ١٣١ ، ١٦١ ، ■ ، ■ ، ٢٥١

**٢٥** ناوەڕاستەی کۆمەڵەی

٢٣ ، ٢٣ ، ١٥ ، ٢٧ ، ٤٠ کامەیە؟

**٢٦** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — عادل ٤ دەستە کارتی هەبوو، هەر دەستەیەك ٢٠ کارتی تێدایە، ٥ کارتی بە تەنیا هەیە، ژمارەی هەموو کارتەکان چەندە؟

أ) (٥ × ٢٠) + ٤  ج) (٤ × ٥) + ٢٠

ب) (٢٠ × ٥) + ٤  د) (٤ × ٢٠) + ٥

وانەی ٨

# ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان
## هەڵبژاردنی کردارێك
## Problem Solving Skills
### Choose The Operation

تێبگە ‹ پلاندابنێ ‹ شیکاربکە ‹ ساغبکەوە

**پێداچوونەوەی خێرا**

ئەژمێربکە.

١ (٢ × ٥) × ٣
٢ ٦ × (٣ × ٢)
٣ ٣ × (٦ × ٢)
٤ ٦ × ٥ × ٤
٥ ٣ × ٢ × ٨

**وردبەوە لە پرسیارەکان** لیستەکە بەکاربهێنە بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات لەسەر هەڵبژادنی کردای گونجاو بۆ شیکاری هەر پرسیارێك.

| | | |
|---|---|---|
| **کۆکردنەوە** | Addition | خستنە پاڵ یەکی کۆمەڵەکان. |
| **لێدەرکردن** | Subtraction | دەرهێنان یان لابردن یان بەراوردکردنی کۆمەڵەکان. |
| **لێکدان** | Multiplication | خستنە پاڵ یەکی کۆمەڵەکانە کە هەمان ژمارەی دانەیان تێدایە. |
| **دابەشکردن** | Division | بەشینەوە بۆ کۆمەڵەکانی کە هەمان ژمارەیان هەبێ لە دانەکان. |

أ ئەگەر یانەیەك لە هەر مانگێك لەو پێنج مانگەی داهاتوو هەمان ژمارەی یارییەکانی مانگی نیسان یاری بکات، ژمارەی یارییەکانی کە ئەنجامی دەدات چەندە؟

ب ئەگەر تیپەکە هەفتانە هەمان ژمارەی یارییەکان ئەنجام بدات ئەوا لە هەفتەیەکی مانگی ئەیلوول چەند یاری ئەنجامداوە.

ج تیپەکە چەند یاری زیاتر ئەنجام داوە لە مانگی أ ب زیاترە لەو یارییانەی کە لە مانگی تەمموز ئەنجامی داوە؟

ژمارەی گشتی یارییەکان لە مانگی نیسان تا مانگی ئەیلوول چەندە؟

د ئەو دوو کردارە جیاوازە چین کە دەتوانی بەکاری بهێنی بۆ شیکاری پرسیاری أ ؟ پرسیاری ب؟




**باسبکە**

- لەم لیستەی سەرەوەی لاپەڕەکە ووشە گونجاوەکان هەڵبژێرە بۆ شیکاری هەموو پرسیارەکانی أ تا د.
- ئەو کردارە یان ئەو کردارانە چین کە بەکارت هێناوە بۆ شیکاری هەردوو پرسیاری ج و د ؟

**شیكاریكە. كردارێك یان كردارەكان بڵێ كە بەكاری دەهێنیت.**

١ تیپی مۆسیقای قوتابخانە لە میانەی ٩ هەفتەدا ماوەی ٣٦ كاتژمێر ڕاهێنانیان كرد، تیپەكە بە هەمان ژمارەی كاتژمێرەكان ڕاهێنانی كرد لە هەر هەفتەیەكدا، ژمارەی كاتژمێرەكانی هەر هەفتەیەك چەندە؟

٢ كاوە قالبێكی شیرینیی كرد بە ٦ ڕیز و هەر ڕیزەی ٨ پارچە بوو، ئایا ژمارە گشتی پارچەكان چەندە؟

٣ لەیلا ١٢ كولێرەی پیتزای كڕی، هەر كولێرەیەك بەشكرابوو بۆ ٨ پارچە، لەیلا چەندەپارچە كولێرەی پیتزای كڕیووە؟

**وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە.**

١٢ چەتر «سەیوان» لە قەراغ دەریایەكی مەلەوانی هەڵدرابوو، لەژێر هەر چەترێك ٤ كەس دانیشتبوون، ژمارەی ئەو كەسانەی لە ژێر چەترەكان دانیشتوون چەندە؟



٤ كام كردار بۆ شیكاركردنی پرسیارەكە دەتوانرێت بەكاربهێنرێت؟

أ ١٢ ÷ ٤    ج ١٢ × ٤

ب ١٢ − ٤    د ١٢ + ٤

٥ ژمارەی ئەو كەسانەی لە ژێر چەترەكان دانیشتبوون چەندن؟

أ ٤    ب ٨    ج ١٦    د ٤٨

## جێبەجێكردنی جیاواز

**بەكارهێنانی پێدراوەكان** خشتەی بەرامبەرە بەكاربهێنە بۆ شیكاركردنی ڕاهێنانەكان لە ٦ تا ٩.

٦ گۆران ٤ كتێب و ٢ تێنووسی كڕی، دووكاندارەكە دەبێ چەندی بۆ بگەڕێنێتەوە ئەگەر ١٠ لەجۆری پێنجسەد دیناری دابێ؟

٧ میران ٣ كاسێت و دوو تێنووس كڕی. میران چەند پارەی داوە؟

٨ پرسیارێك بنووسە زانیارییەكانی ناو خشتەكەی تێدا بەكاربهێنە.

٩ محەمەد دوو كاسێت و كتێبێك و تێنووسێكی كڕی، لۆزان ٦ كاسێتی كڕی. لۆزان چەند پارەی زیاتری داوە لە محەمەد؟

كتێبخانەی گەرەك

| | |
|---|---|
| كتێب | ٢ پێنجسەد دیناری |
| تێنووس | ١ دووسەد و پەنجا دیناری |
| كاسێت | ٣ دووسەد و پەنجا دیناری |

# پێداچوونەوە
# Review

## دڵنیا بوون لە زاراوەکان و چەمکەکان Check Vocabulary and Concepts

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

| |
|---|
| پێچەوانەیی Inverse |
| ڕاستییە پێکەوەبەستراوەکان |
| Facts family |
| بەیەکبەستنەوە |
| Associative |
| ئەنجامی دابەشکردن |
| Quotient |

١ کەڵکی ___؟___ ئەوەیە کە ئەنجامی لێکدان ناگۆڕێت کاتێ پێکەوەی بەستنی ژمارەکان دەگۆڕین.

٢ لێکدان بریتییە لە کردارێکی ___؟___ بۆ کرداری دابەشکردن.

٣ ڕاستییەکانی لێکدان و دابەشکردن کە هەمان ژمارەکان بەکاردەهێنرێن پێی دەوترێت ___؟___ .

## دڵنیا بوون لە کارامەییەکان Check Skills

٤ شرۆڤە بکە چۆن ڕاستییە بنەڕەتییەکان و شێوازەکان بەکاردەهێنی بۆ ئەژمێرکردنی ٦٠ × ٤٠٠ .

ئەژمێر بکە.

٥ $١١ \times ٨$    ٦ $٣ \div ١٨$    ٧ $٨ \div ٥٦$

٨ $٩٠٠ \times ٢٠$    ٩ $(٢ \times ٦) \times ٥$    ١٠ $٢٠ \times ٨٦$

١١ ٦٦ × ٣٠    ١٢ ٤٦ × ٥٠    ١٣ ٩٠٠٠ × ٦٠

نزیک بکەوە بۆ ئەوەی ئەنجامی لێکدان بخەمڵێنی.

١٤ ٢٢٢ × ٨٤    ١٥ ٢٥٢ × ١٥    ١٦ ٩٣١ × ٥٦

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان Check Problem Solving

١٧ ٤٢ قوتابی سەردانی مۆزەخانەی سلێمانی یان کرد، مۆزەخانە پێشوازی لە مێوانان دەکات بەشێوەی کۆمەڵە، ژمارەی هەر کۆمەڵەیەك ٧ کەس بێت. قوتابیان چەند کۆمەڵە پێکدەهێنن؟

١٨ کامل نیازی وا بوو کە زنجیرەیەك لە ٢٥ کتێب بخوێنێتەوە، هەر کتێبێك ١٥٥ لاپەڕەیە، کە کۆتایی بە زنجیرەکە دێت کامل چەند لاپەڕەی خوێندۆتەوە؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## Standardized Test Prep

**ئاگاداربە! Tip!**

- هەموو ووردەکارییەکان بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت بۆ پرسیار.
- وەڵامەکەت ساغبکەوە.

وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانی ١ تا ١٠.

١ ١٤ ٥٨٢ − ٣٠ ٠٠٠

أ ١٥ ٤١٧ ج ١٥ ٤١٨
ب ١٥ ٥٢٨ د جگە لەمانە

٢ ٥ × ٢ × ٨

أ ٥٦ ج ٧٢
ب ٨٠ د ٩٢

٣ نزیککراوەی ٢٧٩ ٧٤٣ ٣ بۆخانەی ملیونان کامەیە؟

أ ٣ ٠٠٠ ٠٠٠ ج ٣ ٧٠٠ ٠٠٠
ب ٤٠٠ ٠٠٠ د ٤ ٠٠٠ ٠٠٠

٤ ٣٢ ١٨٤
٢٧ ٣٦٦−

أ ٥ ٨١٨ ج ٤ ٨١٨
ب ٤ ٧٢٨ د جگە لەمە

٥ ٤٠ × ٤٥

أ ١٨٠ ج ١ ٦٠٠
ب ١ ٨٠٠ د ١٨ ٠٠٠

٦ کام بڕە یەکسانە بە ٢١ ؟

أ (٢٤ − ٨) + ٥ ج (٢٤ + ٨) − ٥
ب ٢٤ − (٨ + ٥) د ٢٤ + (٨ − ٥)

٧ کام ڕاستی لەگەڵ ڕاستییەکانی تر نابەسترێتەوە؟

أ ٢٠ ÷ ٤ = ٥ ج ٣٢ ÷ ٨ = ٤
ب ٥ × ٤ = ٢٠ د ٢٠ ÷ ٥ = ٤

٨ بخەملێنە. کام ئەنجام گەورەترینە؟

أ ٦٧ × ٣٣ ج ٧٨ × ٢٢
ب ٣٢ × ٥٨ د ٩١ × ٣٩

٩ کۆبوونەوە لە کاتژمێر ١٢:٥٥ د.ن دەستی پێکرد و لە کاتژمێر ٢:٤٧ د.ن کۆتایی هات، کۆبوونەوەکە چەندی خایاند؟

أ ٢ ك ٥٢ خ ج ٢ ك ٨ خ
ب ١ ك ٨ خ د ١ ك ٥٢ خ

١٠ دایکی ئازاد دوو نانی پارچەکرد، هەر نانی کرد بە ٨ پارچە. کام بڕە ژمارەی پارچەکان نیشان دەدات؟

أ (٨ ÷ ٢) × ٢ ج ٨ ÷ ٢
ب (٨ × ٢) ÷ ٢ د ٨ × ٢

## ئەوەی دەیزانی بینووسە Write What You Know

١١ خالید ١٦٨ پێنووسی بەشیەوە بەسەر ٦ پاکەت بە یەکسانی، ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە کە دەریببڕێت و ژمارەی پێنووسەکان لە هەر پاکەتێك دەربخات.

١٢ شرۆڤە بکە چۆن دەتوانی بە هزر ٨٠ × ٥٠٠٠ ئەژمێر بکەیت؟ وەڵام بنووسە.

# لێکدان لە ژمارەیەکی دوو ڕەنووسی

# Multiply by 2-Digit Numbers

کوالا جۆرێکە لە وورچە دەگمەنەکان وە هەڕەشەی نەمان و کەمبوونەوەی لەسەرە، کوالا لە دارستانە فێنکەکانی ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئاسیا دەژی، لە زۆربەی کاتەکانیدا بەسەر درەختی کالیپتۆز هەڵدەگەڕێ بۆ خواردنی گەڵاکانی

**شیکاری پرسیارەکان** کوالا لە ڕۆژێدا نزیکەی ١٦ کاتژمێر دەخەوێت. نزیکەی چەند کاتژمێر لە هەفتەیەکدا دەخەوێت؟ وە لە مانگێکدا چەندە؟



# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know

ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

## زاراوەکان Vocabulary

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

| |
|---|
| کۆلکەی کۆکردنەوە Addend |
| ئەنجامی لێکدان Product |
| هێمای لێکدان |
| Partial product |
| کۆلکەی لێکدان |
| Fatcor product |

١ ژمارە ٦٠ لە ڕستەی ٤ × ١٥ = ٦٠ بریتییە لە ___؟___ .

٢ ژمارە ١٢٣ لە ڕستەی ٣ × ١٢٣ = ٣٦٩ بریتییە لە ___؟___ .

٣ ژمارە ١٨ لە ڕستەی ١٨ + ٣٢٢ = ٣٤٠ بریتییە لە ___؟___ .

٤ هێمای × لە ڕستەی ٤ × ٦ = ٢٤ بریتییە لە ؟ .

## لێکدان لە ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی Multiply by 1-Digit Number

ئەنجام ئەژمێر بکە.

٥ ١٢ × ٦

٦ ٤٣ × ٤

٧ ٣٩ × ٣

٨ ٣٥ × ٧

٩ ٢٥ × ٥

١٠ ١٢٥ × ٢

## خەمڵاندنی ئەنجامی لێکدان Estimate Product

ژمارە ڕەنگ شینەکان نزیك بکەوە. ئەنجام بخەمڵێنە.

١١ ١٢ × ٩

١٢ ١٤ × ٦

١٣ ٢١ × ٨

١٤ ٢٧٢ × ٣

١٥ ٣٥٠ × ٧

١٦ ٦٤٩ × ٤

١٧ ٣٢٢ × ٩

١٨ ٧١٨ × ٢

١٩ ٤٤٤ × ٣

# لێکدان لە ژمارەیەکی دوو ڕەنووسی

## Multiply by 2-Digit Numbers

**پێداچوونەوەی خێرا**

ئەژمێر بکە.

١ ١٢ × ٣ ٢ ٢٥ × ٢

٣ ٣١ × ٢ ٤ ٤٠ × ٢

٥ ٣٢ × ٢

### فێربە

لە کێڵگەی زۆراب ٨٨ ڕێڕەو هەیە، لە هەر ڕیڕەوێکیش ٣٥ شتڵی تەماتە هەیە.
ژمارەی شتلە تەماتەکان چەندە؟



### نموونە ١

لێکبدە : ٨٨ × ٣٢

بخەملێنە: ٩٠ × ٣٠ = ٢ ٧٠٠

دەتوانیت بەهای خانەیی و پێکەوە بەستن بەکاربهێنی بۆ لێکدانی ٣٢ × ٨٨

**هەنگاوی ١**

٣٢ بریتییەلە ٢ یەکان و ٣ دەیان.
٢ یەکان لە ٨٨ بدە .

```
   ١
  ٨٨
 ×٣٢
 ١٧٦   ← ٨٨ × ٢
```

**هەنگاوی ٢**

٣ دەیان لە ٨٨ بدە

```
   ٢
   ١
  ٨٨
 ×٣٢
 ١٧٦
٢٦٤٠   ← ٨٨ × ٣٠
```

**هەنگاوی ٣**

کۆبکەوە.

```
   ٢
   ١
  ٨٨
 ×٣٢
 ١٧٦
+٢٦٤٠
٢٨١٦
```

کەواتە لەوێدا ٢ ٨١٦ شتڵی تەماتە هەیە.

لەبەر ئەوەی ژمارە ٢ ٨١٦ نزیکە لە خەملاندنی ٢ ٧٠٠ ئەوا وەڵامەکە شیاوە.

### نموونە ٢

لێکبدە : ١٠٩ × ٣٦

بخەمڵێنە: ١٠٠ × ٤٠ = ٤ ٠٠٠

**هەنگاوی ١**

٦ یەکان لە ١٠٩ بدە.

```
   ٥
 ١٠٩
 ×٣٦
 ٦٥٤   ← ١٠٩ × ٦
```

**هەنگاوی ٢**

٣ دەیان لە ١٠٩ بدە.

```
   ٢
   ٥
 ١٠٩
 ×٣٦
 ٦٥٤
٣ ٢٧٠   ← ١٠٩ × ٣٠
```

**هەنگاوی ٣**

کۆبکەوە.

```
   ٢
   ٥
 ١٠٩
 ×٣٦
 ٦٥٤
+٣٢٧٠
٣٩٢٤
```

کەواتە، خەملاندنەکە شیاوە.

## چەند نموونەی تر

| ج | ب | ا |
|---|---|---|
| ١<br>~~٢~~ ١<br>٥٦٢<br>٣٥ ×<br>٢٨١٠<br>١٦٨٦٠ +<br>١٩٦٧٠ | ٥<br>١٠٩<br>٦١ ×<br>١٠٩ × ١ ⟵ ١٠٩<br>١٠٩ × ٦٠ ⟵ ٦٥٤٠ +<br>٦٦٤٩ | ١<br>٢٠٤<br>٤١ ×<br>٢٠٤ × ١ ⟵ ٢٠٤<br>٢٠٤ × ٤٠ ⟵ ٨١٦٠ +<br>٨٣٦٤ |

## ساغبکەوە

١ شرۆڤەی بکە کاتێك ژمارەیەك لە ژمارەکی دوو ڕەنووسی دەدەیت، بەکام ڕەنووس دەست پێدەکەیت.

لێکبدە. بخەمڵێنە تاوەکو ساغبکەیتەوە.

٢ ٣٧ × ٢٢

٣ ٥٤ × ٣١

٤ ٤٢ × ٢٦

٥ ٣٥٧ × ٤١

٦ ٨٨٨ × ٢٢

٧ ٩٠٤ × ٨٦

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

لێکبدە. بخەمڵێنە تاوەکو ساغبکەیتەوە.

٨ ٤٤ × ٣٥

٩ ٦٣ × ٤٢

١٠ ٧٢ × ٥٩

١١ ٧٦ × ٤٥

١٢ ٩٧ × ٦٥

١٣ ٧١ × ٦١

١٤ ٢٣٧ × ٢١

١٥ ١٨٧ × ٣٥

١٦ ٤١٧ × ٧٢

١٧ ٢١ × ٤٣

١٨ ٥١ × ٦١٢

١٩ ٨٣ × ٩٠٢

## ئەژمێرکردنی هزری. تەواوبکە.

**٢٠** ٢٠ × ١٦ = ٣٢٠ کەواتە، ٢٠ × ١٧ = ■

**٢١** ٤٥ × ٢٨ = ١ ٢٦٠ کەواتە، ٤٥ × ٢٩ = ■

**٢٢** ١٣ × ٥٠ = ٦٥٠ کەواتە، ١٣ × ٤٩ = ■

**٢٣** ٤٥ × ١٧ = ٧٦٥ کەواتە، ٤٥ × ١٦ = ■

## کۆپی بکە و پاشان تەواوبکە.

**٢٤**

٤٥
× ٧٢

١٠ ← ■ × ■
٨٠ ← ■ × ■
٣٥٠ ← ■ × ■
+ ٢ ٨٠٠ ← ■ × ■

٣ ٢٤٠

**٢٥**

٢٣
× ٩٨

٢٤ ← ■ × ■
١٦٠ ← ■ × ■
٢٧٠ ← ■ × ■
+ ١ ٨٠٠ ← ■ × ■

٢ ٢٥٤

**٢٦** ڕەنووسە نادیارەکە بنووسە. شرۆڤە بکە.

٣٥
× ٦■

١■٥
+ ٢ ١٠٠

٢ ٢٧٥

**٢٧** **هەڵەکە لەکوێدایە؟** هەڵەی سالار لەکوێیە؟ وەڵامی ڕاست بنووسە.




**٢٨** **دەرئەنجام** ڕەنووسە نادیارەکە لە ڕستەکەدا دیار بکە. ٩٠٨ × ■ ٣ = ٣١ ٧٨٠. باسبکە چۆن ئەم ڕەنووسەت دۆزییەوە.

**٢٩** کیسەڵ لە یەك خولەکدا دوو مەتر دەڕوات ، لەیەك کاتژمێردا چەند مەتر دەڕوات؟

**وێنە ڕوونکردنەوەییەکە بەکاربهێنە بۆ شیکاری پرسیارەکان لە ٣٠ تا ٣٢.**




**٣٠** بەڕێز سامان گرنگی بەچاندنی پەتاتە دەدات، بەرهەمی ساڵی ٢٠٠٣ چەند تەن زیاتر بوو لە ساڵی ٢٠٠٠؟

**٣١** داهاتی سامان لە ساڵی ٢٠٠٣ گەیشتۆتە چەند ئەگەر هەر تەنێك پەتاتەی بە ١٢٣ هەزار دیناری فرۆشتبێ؟

**٣٢** بەڕێز سامان بەرهەمەکەی لە پەتاتە بۆ ساڵی ٢٠٠٤ بە چەند دەخەمڵێنی. ئەگەر پشت ببەستی بەم وێنە ڕوونکردنەوەییە؟

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** ئەم وێنە ڕوونکردنەوەییە بەکاربهێنە بۆ شیکارکردنی پرسیارەکانی ٣٣ تا ٣٥.




**٣٣** ئەگەر هاتوو نرخی سەبەتەکی قەبارە ناوەند ١٦ هەزار دیناری بێت، نرخی هەموو سەبەتەکانی لەم قەبارەیە پێکەوە چەند؟

**٣٤** ئەگەر هاتوو نرخی سەبەتەکی قەبارە بچووك ١١ هەزار دیناری بێت، نرخی سەبەتەکانی لەم قەبارەیە چەند کەمتر دەبێت لە نرخی سەبەتەکانی قەبارە ناوەند؟

**٣٥** ئەگەر نرخی سەبەتەکانی قەبارە گەورە گەیشتە ٩٠٠ هەزار دینار، نرخی یەك سەبەتە لەم قەبارەیە چەندە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**٣٦**

$$\begin{array}{r} ٩\ ٢٣١ \\ \times ٦ \\ \hline \end{array}$$

**٣٧**

$$\begin{array}{r} ٩٤٢ \\ \times ٥ \\ \hline \end{array}$$

**٣٨** ناوەڕاستە کامەیە؟ ١٨ ، ١٩ ، ١٩ ، ٢٦ ، ٣٥ ، ٢٨ ، ٣٥ ، ٤٠ ، ٤٢ .

**٣٩** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) تەمەنی شوان ٨ ساڵ زیاترەلە تەمەنی هۆگری برای، ئەگەر تەمەنی هۆگر ٢٩ ساڵ بێت، تەمەنی شوان چەندە؟

أ ٢١ ساڵ   ج ٣١ ساڵ

ب ١٣ ساڵ   د ٣٧ ساڵ

## شیکارکردنی پرسیارەکان دەروازەیەك لەسەر زانستەکان

## Link Up to Science

**تۆڕەکان Net works** تۆڕ بریتییە لە سیستەمێکی چەند دانەیی کە هەریەکەیان بە ئەوەی تر گەیەنراو، وەك کۆمەڵە ژمێرەرێك گەیەنرابن بەیەکتر لە دەزگایەکی دیاریکراودا. وێنەکە چەند تۆڕێکی ڕێڕەو ڕوون دەکاتەوە. هەر ڕێڕەوێك لە کردارێکی لێکدانی دیاریکراو دیاردەکات.




- بەدوای ڕێڕەوێك بگەڕێ لەسەرەتاوە تا کۆتایی.
- لە سەرەتادا دەست پێبکە بە ژمارە ٢ .
- کاتێك لە پیتێکەوە دەچیتە پیتێکی تر، ئەنجامی پێشوو لە ژمارەی سەر ڕێڕەوەکە بدە.

**١** ڕێڕەوێك دیار بکە لەسەرەتاوە تاکۆتایی ئەنجام تیادا گەورەتر بێ لە ٥٠٠.

**٢** ڕێڕەوێك دیار بکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی، ئەنجام تیادا بچووکتر بێت لە ١٠٠.

وانەی ٢

# هەڵبژاردنی هۆکارێك

## Choose a Method

**پێداچوونەوەی خێرا**

ئەژمێر بکە.

١ ١٠٠ × ٨٠ ٢ ٤٠ × ٣٠

٣ ٧٠ × ٩٠ ٤ ٦٠٠ × ٨٠

٥ ٧٠٠ × ٤٠

**فێربە**

بازرگانێك سەردانی چەند باخێکی سێوی کرد لە «بەرواری بالا» لە دهۆك.
پاشان ٣٩٨ سندوق سێوی کڕی کە هەر سندوقێك ٤٨ سێوی تێدابوو.
ژمارەی هەموو سێوەکان کڕیویەتی چەندە؟

### نموونە

بخەمڵێنە، پاشان هۆیەکی ئەژمێرکردن هەڵبژێرە بۆ دۆزینەوەی وەڵام.

٥٠ × ٤٠٠ = ٢٠ ٠٠٠

**کاغەز و پێنووس بەکاربهێنە** ئەنجامی لێکدانی ٤٨ × ٣٩٨ = ▭ ئەژمێر بکە.

**هەنگاوی ١**

لە ڕەنووسی یەکان بدە.

```
 ٧ ٦
 ٣٩٨
  ٤٨×
٣٩٨ × ٨ ⟵ ٣١٨٤
```

**هەنگاوی ٢**

لە ڕەنووسی دەیان بدە.

```
 ٣ ٣
 ٧ ٦
 ٣٩٨
  ٤٨×
 ٣١٨٤
٣٩٨ × ٤٠ ⟵ ١٥٩٢٠
```

**هەنگاوی ٣**

ئەنجامی لێکدان کۆبکەوە

```
  ٣ ٣
  ٧ ٦
  ٣٩٨
   ٤٨×
  ٣١٨٤
+١٥٩٢٠
 ١٩١٠٤
```

کەواتە، بازرگانەکە ١٩ ١٠٤ سێوی کڕیوە. لەبەر ئەوەی ژمارە ١٩ ١٠٤ نزیکە لە ژمارەی خەمڵێنراو ٢٠ ٠٠٠،
بۆیە وەڵامەکە شیاوە.

### چەند نموونەیەکی تر

**أ ئەژمێرکردنی هزری بەکاربهێنە**

٤٠ × ٥ ٠٢٥ = ▭

بیربکەوە: ٤٠ × ٥ ٠٠٠ = ٢٠٠ ٠٠٠

و ٤٠ × ٢٥ = ١ ٠٠٠

کەواتە، ٤٠ × ٥ ٠٢٥ = ٢٠١ ٠٠٠

**ب ئامێری ژمێرەر بەکاربهێنە**

٢٤ × ٣٧٠١ = ▭

2 4 x 3 7 0 1 =

88'824

کەواتە، ٢٤ × ٣٧٠١ = ٨٨ ٨٢٤

**بیرت نەچێ** دەتوانی ئەنجامی لێکدان ئەژمێر بکەی بەبەکارهێنانی کاغەز و پێنووس، یان ئامێری ئەژمێرەر یان ئەژمێرکردن بە هزر بیر بکەوە لە ژمارە پێدراوەکان لە پرسیارەکە پێش ئەوەی هۆکارێك هەڵبژێری.

## ساغبکەوە

**١** شرۆڤە بکە کەی دەتوانی ئەژمێرکردن بە هزر بەکاربهێنی لە جیاتی کاغەز و پێنووس.

ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە. ئەو هۆکارە بڵێ کە بەکاری دەهێنیت.

**٢** ١٥٢ × ١١

**٣** ٣١ × ٢٢

**٤** ١ ٧٠٠ × ٥

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە. بخەملێنە بۆ ئەوەی ساغبکەیتەوە.

**٥** ٤٣٤ × ٢٨

**٦** ٢٨٧ × ٧

**٧** ٥٦ × ٦٠

**هەڵەکە لەکوێدایە؟** لە ڕاهێنانەکانی ٨ تا ١٠ هەڵەی جیاوازی باو هەیە. باسی هەر هەڵەیەك بکە. وەڵامی دروست بنووسە.

**٨**
١ ٢٧٤
٦٧×
٨ ٩١٨
٧ ٦٤٤+
١٦ ٥٦٢

**٩**
٥ ٨٧٢
٨٨×
٤٠ ٦٤٦
٤٠ ٦٤٦٠+
٤٤٦ ٠٠٦

**١٠**
٢ ٥٠٠
٣٢×
٥٠٠
٧ ٥٠٠+
٨ ٠٠٠

**١١** گۆڤارێکی وەرزشی ٩ ٨٢٢ بەشدار بووی هەبوو. هەر بەشدار بوویێك مانگانە دوو دانەی بۆ دەچێت لەو گۆڤارە. ژمارەی گۆڤارەکان چەندە کە لە ماوەی ساڵێك بۆ بەشداربووان دەچێت؟

**١٢** باوکی کاروان ١١ تابلۆی هونەری کڕی بە نرخی٦٨ هەزار دیناری بۆ هەر پارچەیەك، وە ٥ گوڵدانی کڕی بە نرخی ١٦ هەزار دیناری بۆ هەر پارچەیەك، باوکی کاروان چەند پارەی داوە؟

**١٣** مرۆڤ ڕۆژانە نزیکەی ٨ کوپ ئاو دەخواتەوە، لەهەفتەیەکدا نزیکەی چەند کوپ ئاو دەخواتەوە؟ وە لە ٣٠ ڕۆژدا چەند کوپ ئاو دەخواتەوە؟

**١٤** **دەرئەنجام** ئەنجامی لێکدان ئەژمێر بکە. ڕێگەکەت شرۆڤە بکە.

٦٨٤ × ٣٦

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

ئەنجامی لێکدان ئەژمێر بکە بۆ هەردوو ڕاهێنانی ١٥ و ١٦.

**١٥** ٤٢ × ٢٠

**١٦** ٥٧ × ٣٠

**١٧** گەشتی دەریایی لە کاتژمێر ٩:١٥پ.ن دەستپێدەکات، وە کاتژمێر ٢:٥٠د.ن کۆتایی دێت. ماوەی گەشتەکە چەند دەخایەنێت؟

**١٨** ئەژمێربکە ١٩ × ٢٧.

**١٩** لە بەیانی ٢٠ حوزەیران تا بەیانی ١٦ ی تەمووز دەکاتە چەند ڕۆژ؟

أ ٢٦ ڕۆژ
ب ٢٨ ڕۆژ
ج ٢٧ ڕۆژ
د ٣٧ ڕۆژ

وانەی ٣

# گەڕان بەدوای ڕێسا
## Find a Rule

**پێداچوونەوەی خێرا**

ئەژمێر بکە.

١ ٣ ÷ ١٢    ٢ ٣ ÷ ٩

٣ ٧ ÷ ١٤    ٤ ٤ ÷ ١٦

٥ ٩ ÷ ٢٧

**فێربە**

**ئامێری ژمارەکان Numerical Machine** لە وەرشەی بیرکاریدا ئامێرێك هەیە ئەگەر ژمارەیەکی خرا ناو چارەسەری دەکا و ژمارەیەکی ترت بۆ دەردەکات، ئەم خشتەیەی خوارەوە هەندێ ژمارە ڕوون دەکاتەوە کە هیوا خستوویتیە ناوی، وە بەرامبەرەکانیان ئەو ژمارانەن کە ئامێرەکە دەریکردوون.



| ناوەوە | دەرەوە |
|---|---|
| ٢٥ | ٥ |
| ٣٠ | ٦ |
| ٣٥ | ٧ |
| ٤٠ | ٨ |
| ٤٥ | ٩ |

بیربکەوە : بەدوای شێوازێك بگەڕێ یارمەتیت بدات بۆ دۆزینەوەی ڕێسایەك.

شێواز : هەر ژمارەیەکی دەرەوە یەکسانە بە ژمارەکەی ناوەوە کە دابەش کراوە بەسەر ٥.

ڕێساکە : دابەش بکە بەسەر ٥.

ناوەوە : ٤٥    دەرەوە : ٤٥ ÷ ٥ = ٩ .

کەواتە، ئەگەر ٤٥ خرایە ناو ئامێرەکە ژمارەی ٩ ت بۆ دەردەچێ.

دەتوانی هاوکێشەیەك بنووسی بۆ دەرخستنی ڕێساکە.

هەر دوو پیتی ن و د بەکاربهێنە لە جیاتی دەرەوە و ناوەوە.

ن ÷ ٥ = د    بیر لە هاوکێشەکە بکەوە وەك ڕێسایەك بۆ ئەوەی بەهای د بدۆزیتەوە. ن دابەشی ٥ بکە.

### نموونە

بەدوای ڕێسایەك بگەڕێ. ڕێساکە بنووسە لەسەر شێوەی هاوکێشە.

**أ**

| ناوەوە | ن | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | د | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ |

ڕێساکە : لە ٦ بدە

ن × ٦ = د

ڕێساکە تاقیبکەوە بەسەر هەر جووتە ژمارەیەکی خشتەکە.

**ب**

| ناوەوە | ل | ٧٢ | ٦٣ | ٥٤ | ٤٥ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | ر | ٨ | ٧ | ٦ | ٥ |

ڕێساکە : دابەشبکە بەسەر ٩

ل ÷ ٩ = ر

## ساغبکەوە

١ شرۆڤە بکە بۆچی ڕێساکە پێویستە تاقیبکرێتەوە لەسەر هەر جووتە ژمارەیەکی خشتەکە.

**بەدوای ڕێسایەکە بگەڕێ. ڕێساکە بنووسە بەبەکارهێنانی پیتەکان.**

٢

| ناوەوە | ن | ٢١ | ٢٨ | ٣٥ | ٤٢ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | د | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ |

٣

| ناوەوە | أ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | ب | ٤٠ | ٤٥ | ٥٠ | ٥٥ |

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**بەدوای ڕێسایەکە بگەڕێ. ڕێسایەك بنووسە بەبەکارهێنانی پیتەکان.**

٤

| ناوەوە | ح | ١٢ | ١١ | ٩ | ٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | ل | ٢٤ | ٢٢ | ١٨ | ١٤ |

٥

| ناوەوە | ل | ١٦ | ٣٢ | ٤٨ | ٦٤ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | ر | ٢ | ٤ | ٦ | ٨ |

٦

| ناوەوە | ش | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | ب | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ |

٧

| ناوەوە | ن | ١٨ | ٢٤ | ٣٠ | ٣٦ |
|---|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | د | ٦ | ٨ | ١٠ | ١٢ |

**بۆ هەر ڕاهێنانێك خشتەیەکی ناوەوە - دەرەوە دروست بکە.**

٨ دابەشبکە بەسەر ١١
ن ÷ ١١ = د

٩ لە ٤ بدە
ن × ٤ = س

١٠ بەسەر ١٠
ج ÷ ١٠ = ر

١١ لە ٧ بدە
د × ٧ = خ

١٢ دابەشبکە بەسەر ٦
ج ÷ ٦ = ن

١٣ لە ٣ بدە
م × ٣ = ل

١٤ بازرگانێك ١ ٠٠٠ یاری منداڵانی هەبوو، پێنج سەد و بیست و شەش یاری منداڵانی لە هەفتەیەکدا فرۆشت. چەند یاری لا ماوە؟

١٥ سەنا وێنەی ٤٨ کارتی جەژنانەی کێشا وە، بەیەکسانی بەسەر ٤ لە هاوڕێکانی دابەشکرد، هەریەکە لە هاوڕێکانی سەنا چەند کارتی جەژنانەیان وەرگرتووە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

١٦ ٢٧ ٩١٦ + ٣٤ ٥٧٨

١٧ ٨٥ ٧٦٩ − ٩٨ ٥٢١

١٨ لە کێڵگەیەکدا ٩ ٧٥٤ سەر مەڕ و ماڵات هەیە، پزیشکی ئاژەڵی ٤ ٦٧٥ سەری ڕۆژی شەممە پشکنی وە ١ ٩٨٧ سەری ڕۆژی دووشەممە پشکنی، ئایا چەند سەر ماوتەوە بۆ ئەوەی بیان پشکنێ؟

١٩ شێوەی درێژی بۆ ژمارە ١٢٢ ٧٨٤ چییە؟

٢٠ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) کام لەمانەی خوارەوە ڕاست نییە؟

أ ٦ ٣٤١ > ٤ ٤٣١

ب ٦ ٢٣٦ = ٦ ٢٣٦

ج ٦٦ ٣٥٧ > ٦ ١٣٥

د ٦ ٨٦٤ < ٦ ٦٩٤

# زێدەتر لەسەر لێکدان
# More About Multiplication

**پێداچوونەوەی خێرا**

ئەژمێر بکە.

١) ٧٢ × ٣  ٢) ٤٩ × ٤
٣) ٦٨ × ٢  ٤) ٦٨ × ٣
٥) ٦٠ × ٤

## فێربە

کاك سۆران فرۆشگای یاری منداڵانی هەیە، مانگی ڕابردوو ٢٣ یاری لێ فرۆشت کە نرخی هەر یارییەك ٧ ٦٢٥ دینارە. ئایا سۆران چەند دیناری وەرگرتووە بەرامبەر نرخی یارییەکان؟

### نموونە

لێکبدە : ٧ ٦٢٥ × ٢٣

بخەمڵێنە : ٢٠ × ٨ ٠٠٠ = ١٦٠ ٠٠٠

**هەنگاوی ١**
لە ڕەنووسی یەکان بدە.

```
  ١ ١
  ٧٦٢٥
    ٢٣×
٧٦٢٥ × ٣ ⟶ ٢٢٨٧٥
```

**هەنگاوی ٢**
لە ڕەنووسی دەیان بدە.

```
  ١ ١
  ٧٦٢٥
    ٢٣×
  ٢٢٨٧٥
٧٦٢٥ × ٢٠ ⟶ ١٥٢٥٠٠
```

**هەنگاوی ٣**
ئەنجامی لێکدان کۆبکەوە.

```
  ١ ١
  ٧٦٢٥
    ٢٣×
  ٢٢٨٧٥
 ١٥٢٥٠٠+
 ١٧٥٣٧٥
```

کەواتە، کاك سۆران ١٧٥ ٣٧٥ دیناری وەرگرتووە.

لەبەر ئەوەی وەڵامی ١٧٥ ٣٧٥ نزیکە لە بڕی خەمڵێنراو ١٦٠ ٠٠٠ بۆیە وەڵامەکە شیاوە.



**أ**

```
   ١
  ٤٠٠٦
    ٢٧×
٤٠٠٦ × ٧ ⟶ ٢٨٠٤٢
٤٠٠٦ × ٢٠ ⟶ ٨٠١٢٠+
  ١٠٨١٦٢
```

**ب**

```
  ٣ ١ ٣
  ٢٥٠٢٥
     ١٦×
٢٥٠٢٥ × ٦ ⟶ ١٥٠١٥٠
٢٥٠٢٥ × ١٠ ⟶ ٢٥٠٢٥٠+
  ٤٠٠٤٠٠
```

## ساغبکەوە

١) شرۆڤە بکە چۆن ٢٨ × ٣ ٦٦٦ لێکدەدەیت.

ئەنجامی لێکدان ئەژمێر بکە. بخەملێنە بۆ ئەوەی ساغبکەیتەوە.

**٢** ٨٩٢ × ٣٧

**٣** ٥ ٦٣٧ × ٥١

**٤** ٢ ٥٦٨ × ٢١

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

ئەنجامی لێکدان ئەژمێر بکە. بخەملێنە بۆ ئەوەی ساغبکەیتەوە.

**٥** ١ ٧٣٥ × ٤٣

**٦** ٩٧ × ٦٨

**٧** ٣ ٧٤٥ × ٢٨

**٨** ٢ ٩٥٤ × ٤٣

**٩** ٨ ٢٢١ × ٥٦

**١٠** ١ ٠٧٦ × ٢٠

**جەبر** ژمارەی نادیار بنووسە.

**١١** ▢ = ٢٣٦ × ٤٥

**١٢** ▢ = ٢ ٠٨٧ × ٣٦

**١٣** ▢ = ٤٧ × ٩٣

**١٤** ٢٤ ٠٠٠ = ▢ × ٢٤

**١٥** ٧٢ ٠٠٠ = ▢ × ٨٠

**١٦** ١ ٤٤٠ = ▢ × ١٢

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** لیستەکە بەکاربهێنە بۆشیکارکردنی راهێنانەکانی ١٧ تا ١٩.

**١٧** نرخی ٢٥ بلیت بۆ قوتابیان چەندە؟

**١٨** نرخی دوو بلیت بۆ خوێندکاران چەند زیاترە لە نرخی دوو بلیت بۆ قوتابیان؟

**١٩** زانا ٢٠ هەزار دیناری هەبوو. ئایا دەتوانێت بلیتێکی قوتابی و کتێب کە نرخەکەی ٥ هەزار دیناری بێت بکرێت؟

| سەیرانێك لە مێرگدا | |
|---|---|
| ساوایان | ١٢ هەزار دینار |
| قوتابیان | ١٦ هەزار دینار |
| خوێندکاران | ١٨ هەزار دینار |



**٢٠** **پرسیارێك بنووسە** دەربارەی کرینی زیاتر لە بلیتێك بۆ خوێندکاران و زیاتر لە بلیتێك بۆ قوتابیان. شیکارەکە بنووسە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**٢١** ٣ ٧٤٥ + ٢ ٦٧٨

**٢٢** ٢ ٩٠٠ − ٤٠٧

**٢٣** ٢٣ ١٨٦ + ٥٠ ٢٢٥

**٢٤** ٢١ ٠٨٩ − ٢٥ ٠٣٠

**٢٥** ٣٧ ٣٢٩ + ٨٤ ٥٨٢

**٢٦** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — لە یاری سەبەتەدا عادل ٣٢ خاڵی تۆمارکرد ١٥ خاڵ لەگێمی یەکەم. کام ڕستەی ژمارەیی ئەمە دەنوێنێ؟

أ) ٣٢ = ▢ − ١٥

ب) ▢ = ١٥ + ٣٢

ج) ٣٢ = ▢ + ١٥

د) ٣٢ = ١٥ − ▢

وانەی ٥

# کارامەییەکانی شیکاری پرسیارەکان
## پرسیارێکی فرەهەنگاو
# Problem Solving Skills
## Multi-step Problem

**پێداچوونەوەی خێرا**

ئەژمێر بکە.

١ ٢١٧ × ٤  ٢ ٣٤٠ × ٢

٣ ٤٩٧ × ٢  ٤ ٥٢٦ × ٣

٥ ٧٠٥ × ٣

تێبگە ‹ پلاندانێ ‹ شیکاربکە ‹ ساغبکەوە

**پەسندترین کارە** بەشی دارستانەکان لە وەزارەتی کشتوکاڵ هەڵمەتێکی دار چاندنی دەست پێکرد لە شەقامە نوێیەکان و باخچە گشتییەکان بۆ ماوەی دوو هەفتە. لە هەفتەی یەکەمدا ٥٢ کرێکار و لە هەفتەی دووەمدا ٤٥ کرێکار نەمامیان چاند. ئەگەر هەر کرێکارێك ٢٢٥ نەمامی چاندبێت، ئایا هەموویان چەند نەمامیان چاندووە؟

**لەبیرت نەچێ** هەندێ جار لەسەرت پێویستە بە زیاتر لە هەنگاوێك هەستیت بۆ شیکارکردنی پرسیارێك. بیر لەو هەنگاوانە بکەوە، پێویستە پێ ی هەستیت.
بەکام هەنگاو دەست دەکەیت بەجێبەجێ کردنی؟



### نموونە

بۆ دۆزینەوەی سەرجەمی نەمامەکان ژمارەی هەموو کرێکارەکان لە ٢٢٥ بدە.

**هەنگاوی ١**

کۆبکەوە بۆ دۆزینەوەی ژمارەی کرێکارەکان.

٥٢ ⟵ کرێکارەکانی هەفتەی یەکەم
+ ٤٥ ⟵ کرێکارەکانی هەفتەی دووەم
٩٧

ژمارەی کرێکارەکان لە دوو هەفتەدا بریتییە لە ٩٧.

**هەنگاوی ٢**

لێکبدە بۆ دۆزینەوەی هەموو نەمامەکان.

٢٢٥ ⟵ ژمارەی نەمامەکانی هەر کرێکارێك کە چاندوویەتی
× ٩٧ ⟵ ژمارەی کرێکارەکان
٢١ ٨٢٥

سەرجەمی نەمامە چێنراوەکان بریتییە لە ٢١ ٨٢٥ نەمام.

### باسبکە

- ئایا دەتوانێت بڕی (٥٢ + ٤٥) × ٢٢٥ بەکاربێنی بۆ ئەوەی پرسیارەکە شیکار بکەی؟ شرۆڤەی بکە.
- ئەگەر یەکەم جار ٥٢ × ٢٢٥ بکەی پاشان ٤٥ × ٢٢٥ بکەی، وە هەردوو ئەنجامەکەت کۆکردەوە، ئایا دەگەیتە هەمان وەڵام؟ شرۆڤە بکە.

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

١ ئەگەر وا دابنێیت کە هەر کارێکارێك ٣٢٥ نەمامی چاندبێت، ئایا ژمارەی نەمامە زیادەکەیەی کە چاندوویانە چەندە؟

٢ ٨ کرێکار هەریەکەیان ١٤٢ نەمامیان چاند و ٦ کرێکاری تر هەریەکان ٨٧ نەمامیان چاند، ئایا هەموو کرێکارەکان چەند نەمامیان چاندووە؟

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بەکاربهێنە بۆشیکارکردنی هەردوو پرسیارەکانی ٣ و ٤.

ئەندازیاری سەرپەرشتیکاری نۆژەنکردنەوەی قوتابخانەیەك لیستێکی پێداویستیەکانی سەرەتایی نۆژەنکردنەوەی ئامادەکرد و لە خشتەکەدا تۆماری کرد.

| جۆر | نرخی پارچەیەك<br>بە هەزار دینار | ژمارە |
|---|---|---|
| بۆڕی ئاو | ٢٥ | ٣٣ |
| پارچەکانی ئاودەست | ٥٨ | ٢٩ |
| کومبار | ١٣٨ | ١٨ |
| تانکی ئاو | ١٣٩ | ١٥ |
| قوتو بۆیاغ | ١٢١ | ٣٢ |

٣ کام ڕستەی ژمارەیی بەکاردەهێنیت بۆ ئەوەی نرخی هەموو بۆڕییەکانی ئاو و پارچەکانی تری ئاودەستەکان بدۆزیتەوە؟

أ $٥٨ + ٢٥$

ب $(٢٩ \times ٥٨) + (٣٢ \times ٢٥)$

ج $(٢٩ \times ٥٨) + (٣٣ \times ٢٥)$

د $(٢٩ + ٣٣) \times (٥٨ + ٢٥)$

٤ جیاوازی نێوان نرخی کومبارەکان «فەرش» و نرخی بۆڕییەکانی ئاو چەندە؟

أ ٤٣٧ هەزار دیناری  ب ٤٤٣ هەزار دیناری  ج ١٦٥٩ هەزار دیناری  د ١٧٤٣ هەزار دیناری

## جێ بەجێکردنی جیاواز

٥ مامۆستا ئازاد کارتۆنێك پێنووسی لابوو. هەر قوتابییەك ١٤ پێنووسی پێدا، کە ژمارەیان ٢١قوتابی بوو، لەناو کارتۆنەکە ١٣١ پێنووس ماوە، لە کارتۆنەکە چەند پێنووس هەبوو؟

٦ باوکی یوسف ١٦ هەزار دیناری دا لەبری نرخی بلیتەکانی خۆی و هەریەکە لە دوو منداڵەکەی. ئەگەر نرخی بلیت بۆ گەورە دوو هێندی نرخی بلیتی منداڵێك بێت، باوکی یوسف چەند پارەی داوە بۆ نرخی بلیتێك؟

٧ سروە و بەیان یاری ژمارەکانیان دەکرد. سروە ژمارەیەکی هەڵبژارد و چواری زیادکرد، پاشان سەرجەمی لە ٦ دا، دوای ٣ی لە ئەنجامەکە دەرکرد، ئەنجامەکە بوو بە ٥١، ئەو ژمارەیەی کە سروە هەڵیبژارد چەندە؟

٨ دانا و هیوا و سۆران و گۆران لە ڕیزێك وەستان، دانا ڕاستەوخۆ لەدوای هیوا وەستاوە، بەڵام سۆران لە نێوان گۆران و دانا وەستاوە، کێ یەکەم کەسە؟

٩ **پرسیارێك بنووسە** پێویستی هەبێ بە زیاتر لە دوو هەنگاو بۆ شیکارکردنی، شیکارەکە بنووسە.

١٠ ئەندامانی تیپێك مەشقدەکەن لە کاتژمێر ٣:١٠ د.ن تا کاتژمێر ٥:٢٥د.ن دوو جار لە هەفتەیەکدا، لە ماوەی ٤ هەفتەدا چەند کاتژمێر مەشقدەکەن؟

# پێداچوونەوە
# Review

## دڵنیا بوون لە زاراوەکان و چەمکەکان Check Vocabulary and Concepts

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

| |
|---|
| پرسیارێکی فرە هەنگاو Multi-step problem |
| سەرجەم Sum |
| یەکان Ones |
| ناوەوە In |
| دەرەوە Out |

١ ئەو پرسیارەی کە پێویستی بە زیاتر لە هەنگاوێك هەیە بۆ شیکارکردن بریتیی لە ــــ؟ــــ .

٢ ئەو ژمارەیەی کە دەخرێتە ناو ئامێرەکە بۆ ئەژمێرکردنی ئەنجامی لێکدان پێ ی دەوترێت ــــ؟ــــ .

٣ کاتێك دوو ژمارە لێکدەدەین، دەست دەکەین بە لێکدان لە ڕەنووسی ــــ؟ــــ .

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان Check Skills

ئەنجامی لێکدان ئەژمێر بکە. بخەمڵێنە بۆ ئەوەی ساغبکەیتەوە.

٤ ٣٩ ١٦×

٥ ٥٤ ٣٣×

٦ ١٤٣ ٦٢×

٧ ٩٢ ٥٨×

٨ ٦١ ٢٩×

٩ ٢ ٣٠٣ ٦٧×

١٠ ٦٧ ٨٢×

١١ ٢٩٧ ٣٤×

١٢ ٩ ٧٠٩ ٣٦×

١٣ ٦٠٤ ٥٥×

١٤ ٢٥٣ ٣١×

١٥ ٤ ٣٢٦ ٤١×

## دڵنیا بوون لە شیکاری پرسیارەکان Check Problem Solving

١٦ لە هۆڵێکی ئاهەنگی بەبۆنەی جەژنی نەورۆزدا ئاهەنگێك سازکرا، ژمارەی ئەوانەی بەپێوە وەستابوون ٣٤ کەس بوون، بەڵام ئەوانەی دانیشتبوون ٢٨ ریزیان پڕکردبووەوە، هەر ریزێك ١٤ کەسی تێدابوو، ئایا سەرجەمی هەموو ئامادەبووان لەم ئاهەنگە چەند بووە؟

١٧ لە کۆگایەکی پەراوگەدا ٢٥ پاکێت هەبوو. هەر پاکەتێك ٣٦ ڕاستەی بچووك و ناوەندی تێدابوو، وە ٢٤ پاکەتی تر هەبوو کە هەر پاکەتێك ٣٢ ڕاستەی گەورەی تێدابوو، ئایا ژمارەی هەموو ڕاستەکان چەندە؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
# Standardized Test Prep

**ئاگاداربە! Tip!**

- هەموو وردەکارییەکان بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت بۆ پرسیار.
- وەڵامەکەت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانەکانی ١ تا ٦.**

١ باشترین خەمڵاندن بۆ سەرجەمی
٢ ٩٣٤ + ٤ ٧١٢ کامەیە؟

أ ٧ ٠٠٠ ‏ ج ٨ ٠٠٠
ب ٩ ٠٠٠ ‏ د ١٠ ٠٠٠

٢ باشترین خەمڵاندن بۆ ئەنجامی لێکدانی
٣٨ × ٢١٦ کامەیە؟

أ ٦ ٠٠٠ ‏ ج ٨٠ ٠٠٠
ب ٦٠ ٠٠٠ ‏ د ٨ ٠٠٠

٣ ئەم کاتەی کاتژمێرەکە نیشانی دەدات چەندە؟




أ ١٢:٠٧ ‏ ج ١:٠٧
ب ١٢:٥٢ ‏ د ١:٥٢

٤ ٢٤ قوتابی ئامادەبوون لە یاریگە بۆ بینینی یاری تۆپی پێ. نرخی بلیتی چوونە ژوور ٧ هەزار دینار بوو، هاوکار ویستی بە هزر نرخی بلیتەکان ئەژمێر بکات. کام ڕستە ڕێگایەك پێکدەهێنێ بۆ ئەژمێرکردنی ٧ × ٢٤ ؟

أ ٤ + (٧ × ٢٠)
ب ٧ ٤ × ٢٠
ج (٧ × ٤) + (٧ × ٢٠)
د ٧ + ٤ + ٢٠

٥ ■ = ٥ ٦٨٢ × ١٤

أ ٧٦ ٦٤٨ ‏ ج ٧٩ ٦٤٨
ب ٧٧ ٢٨٤ ‏ د ٧٩ ٥٤٨

٦ گۆڤەند ١٥ هەزار دیناری هەبوو، ٥ هەزار دیناری دا بە چوونە ژوورەوەی پیشانگایەك، ٤ هەزار دیناری دا بە خواردن، کام ڕستەی ژمارەیی ڕێگا دەدات بۆ ئەژمێرکردنی پارەی ماوە لای گۆڤەند؟

أ ٤ + (٥ − ١٥) ‏ ج (٤ + ٥) − ١٥
ب (٤ − ٥) − ١٥ ‏ د ٥ − ٥ + ١٥

## ئەوەی دەیزانی بینووسە — Write What You Know

٧ لە ساڵێکدا ٣٦٥ ڕۆژ هەیە، تەمەنت گەیشتووەتە چەند ساڵ بڵێ، وە ژمارەی ڕۆژەکانی کە بەسەر تەمەنت تێپەڕیوە لە ڕۆژی لەدایك بوونتەوە بخەملێنە.

٨ سۆران ١٢ هەزار دینار کرێ وەردەگرێت بۆ هەر کاتژمێرێك کارکردن، لە هەفتەی ڕابردوو ڕۆژانی شەممە و دووشەممە ٨ کاتژمێر کاری کردووە، وە ڕۆژانی یەکشەممە و سێ شەممە و پێنج شەممە ٧ کاتژمێر کاری کردووە. سۆران چەند هەزار دیناری وەرگرتووە؟ شرۆڤە بکە.

بەشی ٦

# دابەشکردن بەسەر ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی

# Divide by 1-Digit Number

لە هەموو ساڵێکدا هەزاران کیسەڵی سەوزی ئەتلسی کۆچ دەکەن و هەزاران کیلۆمەتر دەبڕن لە کەنارەکانی بەرازیل تا دورگەی ئەسانسیۆن لە ئۆقیانووسی ئەتلەسی.

شیکاری پرسیار هەر کیسەڵێکی سەوز ڕۆژانە نزیکەی ١٠٠کم دەبڕێت، چەند ڕۆژی دەوێت تاوەکو ماوەی ٢٢٠٠ کم ببڕێت.

| کۆچ کردنی گیانداران | |
|---|---|
| گیاندار | ماوەی خەمڵێنراو بە «کم» |
| کیسەڵی سەوز | ٢٢٠٠ |
| مراوی ئەتلەسی | ٢٠٠٠٠ |
| نەهەنگی خۆڵەمێشی | ٢٠٠٠٠ |



# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know

ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

## زاراوەکان Vocabulary

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

بیر بکەوە لە نموونەی ٥٦⟌٧ (ئەنجام: ٨) :

| |
|---|
| بەشدراو Divisor |
| بەشکراو Dividend |
| ئەنجامی دابەشکردن Quotient |
| دابەش دەکات Divide |

١ ــــ؟ــــ بریتییە لە ٨.

٢ ــــ؟ــــ بریتییە لە ٧.

## ڕاستییەکانی دابەشکردن Division Facts

ڕاستییەکی دابەشکردنی گونجاو بۆهەر نموونەیەك بنووسە.

٣ 

٤ 

٥ 

ئەنجامی دابەشکردن ئەژمێر بکە.

٦ ٥٠ ÷ ٥ =　　٧ ٤٥ ÷ ٩ =　　٨ ٦٦ ÷ ٦ =

٩ ١٠٠ ÷ ١٠ =　　١٠ ٦٤ ÷ ٨ =　　١١ ٦٠ ÷ ٥ =

## ڕاستییە پێکەوەبەستراوەکان Facts Family

ژمارەی نادیار بنووسە.

| ١٢ | ١٣ | ١٤ |
|---|---|---|
| ٥ × ٨ = ٤٠ | ٣ × ٩ = ٢٧ | ٨ × ٧ = ٥٦ |
| ٨ × ٥ = ■ | ٩ × ٣ = ■ | ٧ × ■ = ٥٦ |
| ٤٠ ÷ ■ = ٥ | ٢٧ ÷ ■ = ٣ | ٥٦ ÷ ■ = ٧ |
| ٤٠ ÷ ■ = ٨ | ٢٧ ÷ ■ = ٩ | ■ ÷ ٧ = ٨ |

| ١٥ | ١٦ | ١٧ |
|---|---|---|
| ٦ × ٤ = ٢٤ | ٧ × ٥ = ٣٥ | ٩ × ٧ = ٦٣ |
| ٤ × ٦ = ■ | ٥ × ■ = ٣٥ | ٧ × ٩ = ■ |
| ■ ÷ ٤ = ٦ | ٣٥ ÷ ٧ = ■ | ٦٣ ÷ ■ = ٧ |
| ■ ÷ ٦ = ٤ | ٣٥ ÷ ■ = ٧ | ■ ÷ ٧ = ٩ |

**پێداچوونەوەی خێرا**

ئەژمێربکە.

1. ٤ × ٨
2. ٣ ÷ ١٥
3. ٧ × ٣
4. ٤ × ٦
5. ٤ ÷ ٣٢

**زاراوەکان**

ماوە **Remainder**

وانەی ١

# دابەشکردن

## Division



**فێربە**

مریشکێك ٤٩ هێلکەی کرد لە وەرزی بەهاردا. خاوەنەکەی بە یەکسانی بەسەر ٣ سەبەتەدا دابەشیکرد، لە هەر سەبەتەیەکدا چەند هێلکەی دانا؟ چەند هێلکە لە دەرەوەی سەبەتەکەدا ماوە؟

### نموونە ١

٤٩ بەسەر سێ کۆمەڵەی یەکسان دابەشبکە: ٤٩ ÷ ٣ یان ٣⟌٤٩ .

شێوازێك دروست بکە ژمارەی هێلکەکان لە هەر کۆمەڵەیەکدا دیاربکات.

**هەنگاوی ١** وێنەی چەند بازنەیەك بۆ پێکهێنانی ٣ کۆمەڵەی یەکسان بکێشە.



**هەنگاوی ٢** هەمان ژمارە لە دەیەکان لەناو هەریەك لە بازنەکان دابنێ.



**هەنگاوی ٣** دەیەکەی ماوە خوردبکەوە بۆ یەکان، پاشان یەکەکان بە یەکسانی بەسەر بازنەکەندا دابەشبکە.



کەواتە هەر سەبەتێك ١٦ هێلکەی تێدایە. وە یەك هێلکە ماوەتەوە.

کرداری دابەشکردنەکە بەم شێوەی خوارەوە دەنووسین ٤٩ ÷ ٣ = ١٦ ماوە ١

### نموونە ٢

٤٩ دابەشبکە بەسەر ٣ دا. ٤٩ ÷ ٣ یان ٣⟌٤٩ بنووسە.

**هەنگاوی ١**

٤ دەیەکە دابەشبکە.

٤ دابەشبکە بەسەر ٣
١ جارانی ٣ بکە
٤ − ٣ لێدەربکە
١ < ٣ بەراوردبکە

$$\begin{array}{r} ١\phantom{٩} \\ ٣\overline{)٤٩} \\ -\ ٣\phantom{٩} \\ \hline ١\phantom{٩} \end{array}$$

پێویستە جیاوازیەکە کە دەکاتە ١ کەمتر بێت لە بەشدراوەکە ٣ .

**هەنگاوی ٢**

٩ یەکەکان بێنە خوارەوە. ١٩ یەکانەکە بەسەر ٣ دا دابەشبکە.

١٩ ÷ ٣ دابەش بکە
لێکبدە ٣ × ٦
لێدەربکە ١٩ − ١٨
بەراوردبکە ١ < ٣

$$\begin{array}{r} ١٦ \\ ٣\overline{)٤٩} \\ -\ ٣\downarrow \\ \hline ١٩ \\ -\ ١٨ \\ \hline ١ \end{array}$$

**هەنگاوی ٣**

ساغبکەوە

$$\begin{array}{r} ١٦ \\ ٣\overline{)٤٩} \\ -\ ٣\phantom{٩} \\ \hline ١٩ \\ -\ ١٨ \\ \hline ١ \end{array}$$

ئەنجامی دابەشکردن ⟵ ١٦
بەشدراو ⟵ ٣ ×
٤٨
ماوە ١ ⟵ ١ +
بەشکراو ٤٩

## ساغبکەوە

**١** بەهای هەموو ماوەیەك كە لە دابەشكردن بەسەر ٥ دا دەستت دەكەوێت بنووسە.

دابەشبکە و ساغبکەوە.

**٢** ٤⟌٥٨ **٣** ٣⟌٦٥ **٤** ٦٢ ÷ ٤ **٥** ٩٥ ÷ ٨

ڕستەی ساغکردنەوە بۆ هەر کردارێکی دابەشکردن بنووسە.

**٦** ٧٨ ÷ ٦ = ١٣ **٧** ٩٣ ÷ ٧ = ١٣ م ٢ **٨** ٥٢ ÷ ٣ = ١٧ م ١

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

دابەشبکە و ساغبکەوە.

**٩** ٤⟌٨٤ **١٠** ٥⟌٦٨ **١١** ٨⟌٩١ **١٢** ٦٩ ÷ ٥

کرداری دابەشکردن بۆهەر ڕستەیەك بنووسە و ساغبکەوە.

**١٣** (١٢ × ٦) + ٣ = ٧٥ **١٤** (٢٥ × ٣) + ٢ = ٧٧

**جەبر** ژمارە نادیارەکان بنووسە.

**١٥** ٩٧ ÷ ٥ = ١٩ م ■
( ■ × ■ ) + ٢ = ٩٧

**١٦** ٩٧ ÷ ٧ = ■ م ٦
( ■ × ■ ) + ٦ = ٩٧

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** بۆ ڕاهێنانەکانی ١٧ و ١٨.
وێنە ڕوونکردنەوەییەکە بەکار بهێنە.




**١٧** **دەرئەنجام** یاریزانانی ڕۆژانی دووشەممە و سێ شەممە بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ کۆبوونەوە، هەر ٤ یاریزان بەدەوری مێزێکدا دانیشتن. یاریزانان پێویستیان بە چەند مێز هەیە؟

**١٨** **پرسیارێك بنووسە** پێدراوەکانی وێنە ڕوونکردنەوەییەکە بەکاربهێنە. پرسیارێك دروست بکە کە شیکارەکەی پێویستی بە کرداری دابەشکردن بێ.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**١٩** ١ ٦٥٠ − ٩٣٨

**٢٠** ١ ٨٧٩ + ٢ ٥٤٨

**٢١** ٢٧ × ١٩

**٢٢** ٤⟌٦٥

**٢٣** لەم شێوازەدا دوو ژمارەی نادیارەکە کامەن؟
١٢، ٢٤، ■، ٤٨، ٦٠، ■، ٨٤؟

**٢٤** ٢٠ × ١٥ = ٣٠٠، کەواتە، ٢٠ × ١٦ = ■

**٢٥** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) ئامەد ٦٠ کتێبی بە یەکسانی بە ٤ خانەدا دابەشکرد، لە هەر خانەیەکدا چەند کتێب هەیە؟

أ ١٤ ب ١٥ ج ٦٤ د ٢٤٠

## پێداچوونەوەی خێرا

١ ٣ × ٢٠    ٢ ٦٠ ÷ ٣

٣ ٢ × ٤٠    ٤ ٨٠ ÷ ٢

٥ ٣ × ٣٠٠

وانەی ٢

# ئەژمێرکردنی هزری: شێوازەکان لە دابەشکردندا

# Mental Math: Division Patterns

### فێربە

سوپەرمارکێتێك ١٨٠٠ ئامێری خلێسکاندنی هێنا، بەیەکسانی بەشیەوە بەسەر هەرسێ لقەکانی خۆیدا، ئایا هەر لقێکی چەند ئامێری خلێسکاندنی بەرکەوتووە؟



### نموونە

دابەش بکە ١٨٠٠ ÷ ٣

ڕاستییە بنەڕەتییەکان و شێوازەکان بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی دابەشکردن بە هزر.

| بەشکراو | | بەشدراو | | ئەنجامی دابەشکردن |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | ÷ | ٣ | = | ٦ |
| ١٨٠ | ÷ | ٣ | = | ٦٠ |
| ١٨٠٠ (دوو سفر) | ÷ | ٣ | = | ٦٠٠ (دوو سفر) |

کەواتە، بەشی هەر لقێك دەکاتە ٦٠٠ ئامێری خلێسکاندن.

**لەبیرت نەچێ** لە ئەنجامی دابەشکردن ژماری سفرەکان زیاد دەبێت هێندەی ئەو سفرانەی کە لە بەشکراوەکە زیاد دەکرێت.

### چەند نموونەیەکی زیاتر

أ
٧٢ ÷ ٩ = ٨    بیربکەوە: ٨ × ٩ = ٧٢
٧٢٠ ÷ ٩ = ٨٠
٧٢٠٠ ÷ ٩ = ٨٠٠

ب
٤٠ ÷ ٨ = ٥    بیربکەوە: ٨ × ٥ = ٤٠
٤٠٠ ÷ ٨ = ٥٠
٤٠٠٠ ÷ ٨ = ٥٠٠

• شرۆڤە بکە بۆچی لە بەشکراو سفرێك زیاتر دەبینرێت لە ژمارەی سفرەکانی ئەنجامی دابەشکردن لە نموونەی ب؟

### ساغبکەوە

١ ژمارەی سفرەکان لە ئەنجامی دابەشکردنی ٧٢٠٠٠ ÷ ٩ چەندە ،هەروەها لە ئەنجامی دابەشکردنی ٤٠٠٠٠ ÷ ٨ چەندە؟

ڕاستییە بنەڕەتییەکان و شێوازەکان بەکاربهێنە بۆ ئەوەی ئەنجامی دابەشکردن بنووسی.

**٢** ٥٦٠ ÷ ٧ 
٥٦٠٠ ÷ ٧

**٣** ٥٤٠ ÷ ٦ 
٥٤٠٠ ÷ ٦

**٤** ٢٠٠ ÷ ٥ 
٢٠٠٠ ÷ ٥

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

ڕاستییە بنەڕەتییەکان و شێوازەکان بەکاربهێنە بۆ ئەوەی ئەنجامی دابەشکردن بنووسی.

**٥** ٢٧٠ ÷ ٣ 
٢٧٠٠ ÷ ٣

**٦** ٦٣٠ ÷ ٩ 
٦٣٠٠ ÷ ٩

**٧** ٣٠٠ ÷ ٥ 
٣٠٠٠ ÷ ٥

بە هزری دابەش بکە. ڕاستییەکی بنەڕەتی دابەشکردن بنووسە.

**٨** ٤٥٠ ÷ ٩   **٩** ٢١٠ ÷ ٧   **١٠** ١٦٠ ÷ ٨

**١١** ٦٣٠٠ ÷ ٧   **١٢** ٣٠٠٠ ÷ ٦   **١٣** ١٨٠٠ ÷ ٩

جەبر — ژمارەی نادیار بنووسە.

**١٤** ٤٢٠ ÷ ٧ = ■   **١٥** ■ ÷ ٩ = ٣٠   **١٦** ٣٥٠ ÷ ■ = ٥٠

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** ئەم وێنەدارە بۆ ڕاهێنانەکانی ١٧ تا ٢٠ بەکاربهێنە.

**١٧** هەر پاکەتێکی تۆپی تێنس ١٠٠ تۆپی تێدایە. ژمارەی تۆپەکانی تێنس لە فرۆشگاکەدا چەندە؟

**١٨** ژمارەی تۆپەکانی سەبەتە و باڵە چەند لە تۆپەکانی گۆلف زیاترن؟




**١٩** **پرسیارێك بنووسە** بە بنیاتنان لەسەر زانیارییەکانی وێنەدارەکە، وە شیکارکە پێویستی بە ڕاستییەکی بنەڕەتی دابەشکردن و شێوازەکان هەبێت؟

**٢٠** ئەگەر فرۆشگاکە ٢٠٠٠ تۆپی تر بهێنێت، وە ژمارەیەکی یەکسان لە هەر جۆرێك لە خۆبگرێت ، ژمارەی تۆپەکان لە هەر جۆرێك دەبێتە چەند لە فرۆشگاکە؟

### پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**٢١** ٤٥ 
٢٧×

**٢٢** ٩٨٥ 
١٣٠٧+

**٢٣** ٦١ ٨٧٩ بۆ نزیکترین سەد نزیکبکەوە.

**٢٤** ٢٠٦ ٧١٤ بۆ نزیکترین هەزار نزیکبکەوە.

**٢٥** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) ژمارەی ڕووەکانی شەش پاڵو چەندە؟

أ ٤   ب ٥   ج ٦   د ٨

وانەی ٣

# خەملاندنی ئەنجامی دابەشکردن

## Estimate Quotients

**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٧ × ٤
٢ ٧٠ × ٤
٣ ٧٠٠ × ٤
٤ ٢٨٠ ÷ ٤
٥ ٢٨٠٠ ÷ ٤

**فێربە**

فیلێکی بچووك هەفتەی ٥٢٨کگم خواردن دەخوات. ڕۆژێ نزیکەی چەند کیلۆگرام خواردن دەخوات؟

بخەملێنە :٥٢٨ ÷ ٧



بەدوای ژمارەکانی نزیك لە بەشکراوی ٥٢٨ بگەڕێ تا دابەشکردنی ئاسان بێت بەسەر ٧ دا.

دەتوانی ڕاستییەکانی دابەشکردن بەسەر ٧ و شێوازەکانی بەکاربهێنی.

٤٩٠ ÷ ٧ — بیریکەوە :٥٢٨ دەکەوێتە نێوان٤٩٠ و ٥٦٠

٥٦٠ ÷ ٧ — کەواتە، یەکێك لەو دوو ژمارەیە بەکاربهێنە.

هەر دوو ژمارەی ٤٩٠ و ٥٦٠ گونجاون بۆخەملاندنی ٥٢٨ ÷ ٧.

بۆ خەملاندن، چیا ٤٩٠ی بەکارهێنا و ئاران ٥٦٠ی بەکارهێنا. کەواتە، هەریەك لە ٧٠ و ٨٠ خەملاندنێکی گونجاوە.

| ئاران | چیا |
|---|---|
| ٥٦٠ ÷ ٧ | ٤٩٠ ÷ ٧ |
| ٥٦٠ ÷ ٧ = ٨٠ | ٤٩٠ ÷ ٧ = ٧٠ |
| فیلە بچووکەکە نزیکەی ٨٠ کگم لە ڕۆژێکدا دەخوات. | فیلە بچووکەکە نزیکەی ٧٠ کگم لە ڕۆژێکدا دەخوات. |

**لەبیرت نەچێ** دەتوانی ژمارە گونجاوەکان بەکاربهێنی تا ئەنجامی دابەشکردن بخەملێنی.

• پیروز ٣٤٦ ÷ ٧ خەملاند بە نزیککردنەوەی بەشکراو بۆ ٣٠٠. ئایا ٣٠٠ هەڵبژاردنێکی باشە؟ شرۆڤە بکە.

## ساغبکەوە

١ ژمارەیەکی گونجاو بڵێ تا ئەنجامی دابەشکردنی ٣٣١ ÷ ٤ بخەمڵێنی.

پیتی گونجاو بۆ باشترین خەملاندن هەڵبژێرە.

٢ ٢٦٧ ÷ ٧ — أ ٣ یان ٤ — ب ٥ یان ٦ — ج ٣٠ یان ٤٠

٣ ٣٤٨ ÷ ٥ — أ ٦ یان ٧ — ب ٤٠ یان ٥٠ — ج ٦٠ یان ٧٠

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

پیتی گونجاو هەڵبژێرە بۆ باشترین خەملاندن بۆ ئەنجامی دابەشکردن.

٤ ٢٤٢ ÷ ٣ — أ ٦ یان ٧ — ب ٨ یان ٩ — ج ٨٠ یان ٩٠

٥ ٣٧٢ ÷ ٦ — أ ٦٠ یان ٧٠ — ب ٥٠ یان ٦٠ — ج ٦ یان ٧

ئەنجامی دابەشکردن بخەملێنە بە بەکارهێنانی ژمارە گونجاوەکان.

٦ ٥⟌٤٠٨ — ٧ ٩⟌٥٩٠ — ٨ ٤⟌١٣٧

٩ ٨⟌٤٤٤ — ١٠ ٩⟌٦٦٠ — ١١ ٨⟌٧١٣

خەملاندن بەکاربهێنە تا د یاربکەی ئەنجامی کام دابەشکردن گەورەترە لەوەی تر.

١٢ ١٩٠ ÷ ٣ یان ١٦٥ ÷ ٤ — ١٣ ٤٧٥ ÷ ٨ یان ٣٥٥ ÷ ٥ — ١٤ ٣٤٩ ÷ ٥ یان ٧٠٣ ÷ ٨

١٥ ٥٥٥ ÷ ٧ یان ٣٠٣ ÷ ٦ — ١٦ ٧٧٧ ÷ ٨ یان ٨٨٨ ÷ ٧ — ١٧ ٢٠٠٠ ÷ ٧ یان ٩٩٩ ÷ ٢

١٨ فیلەکان هەردەم بە کۆمەڵەی ٨ دانەیی هاتوو چۆ دەکەن. ژمارەی کۆمەڵەکان بخەملێنە ئەگەر ژمارەی فیلەکان ١٣٥ فیل بێت.

١٩ **هەڵەکە لەکوێدایە؟** فیل هەفتەی ١٥٤٠ کگم خواردن دەخوات. ئازاد خەملاندی کە فیل ڕۆژانە ٣٠٠ کگم خواردن دەخوات، هەڵەی ئازاد دیار بکە و باشترین خەملاندن بڵێ.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

٢٠ ١٣٢٣٨ − ٨١٧٩

٢١ ١٢٦ ÷ ٩

٢٢ ئەنجامی لێکدانی ٦ × ٤ × ٣ بنووسە.

٢٣ ژمارەی نادیار بنووسە.
١٨ − ٩ = ■ + ٢

٢٤ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) نەوزاد لە کاتژمێر ١١:١٥پ.ن بە پایسکیلەکەی دەرچوو، لە کاتژمێر ١٢:٤٥ د.ن وەستا بۆ ماوەی ٣٠ خولەك بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ، پاشان کاتژمێر ٢:٠٠د.ن گەڕایەوە بۆ ماڵ. نەوزاد چەند بەسەر پایسکلیەکەیەوە بوو؟

أ ١ ك و ٤٥ خ — ج ٢ ك و ٣٠ خ
ب ٢ ك و ١٥ خ — د ٢ ك و ٤٥ خ

وانەی ٤

# جێبەجێکردنی دابەشکردن
## Division Procedure

**پێداچوونەوەی خێرا**

١. ٣٦ ÷ ٤  ٢. ٨ × ٣

٣. ٧ × ٥  ٤. ٤٩ ÷ ٧

٥. ٢٥ ÷ ٥

### فێربە

کارگێری قوتابخانە ٢٦٥ پارچە کاغەزی مقەبای بەسەر ٥ مامۆستا دابەشکرد بۆ چالاکییە هونەرییەکان. بەشی هەر مامۆستایەك چەندە؟



**ڕێگای یەکەم** بخەمڵێنە تا خانەی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردندا دیار بکەی.
٢٦٥ بەسەر ٥ دا دابەشبکە ٥⟌٢٦٥ .

**هەنگاوی ١**
بخەمڵێنە
بیربکەوە :
٥⟌٢٥٠ = ٥٠ یان ٥⟌٣٠٠ = ٦٠
٥⟌٢٥٠ کەواتە، ڕەنووسی یەکەم دەکەوێتە خانەی دەیان

**هەنگاوی ٢**
٢٦ دەیی بەسەر ٥ دابەشبکە.
٥⟌٢٦٥ ، ٥ ، − ٢٥ ، ١
٢٦ بەسەر ٥ دابەشبکە
لێکبدە ٥ × ٥
دەربکە ٢٦ − ٢٥
بەراورد بکە ١ < ٥

**هەنگاوی ٣**
٥ یەکان بهێنە خوارەوە پاشان ١٥ یەکان دابەشی ٥ بکە.
٥⟌٢٦٥ ، ٥٣ ، − ٢٥ ، ١٥ ، − ١٥ ، ٠
دابەشبکە ٥⟌١٥
لێکبدە ٥ × ٣
لێدەربکە١٥ − ١٥
بەراورد بکە٠ < ٥

کەواتە، بەشی هەر مامۆستایەك ٥٣ پارچە کاغەزی مقەبایە.



**ڕێگای دووەم** بەهای خانەیی بەکاربهێنە بۆ دیارکردنی خانەی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردندا.
٢٥٤ دابەش بکە بەسەر ٤ بنووسە ٤⟌٢٥٣ .

**هەنگاوی ١**
بەهای خانەیی بەکاربێنە بۆ دیارکردنی خانەی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردندا
٤⟌٢٥٣ ٢ > ٤ . کەواتە تەماشای دەیەکان بکە
٤⟌٢٥٣ ٢٥ < ٤ . کەواتە ٢٥ دە بەکاربهێنە.
ڕەنووسی یەکەم لە خانەی دەیان دابنێ.

**هەنگاوی ٢**
٢٥ بەسەر ٤ دابەشبکە.
٤⟌٢٥٣ ، ٦ ، − ٢٤ ، ١
دابەشبکە ٤⟌٢٥
لێکبدە ٤ × ٦
لێدەربکە٢٥ − ٢٤
بەراورد بکە١ < ٤

**هەنگاوی ٣**
٣ یەکان بهێنە خوارەوە.
١٣ یەکان دابەشی ٤ بکە.
٤⟌٢٥٣ ، ٦٣ ، − ٢٤ ، ١٣ ، − ١٢ ، ١
دابەشبکە ٤⟌١٣
لێکبدە ٤ × ٣
لێدەربکە١٣ − ١٢
بەراورد بکە١ < ٤

## ساغبکەوە

١ چۆن خەملاندن بەکاردەهێنیٚ تا بڕیار بدەی لەسەر ئەوەی کە وەڵام لە کرداری دابەشکردنی ٩٠٣ ÷ ٣ = ٣١ وەڵامێکی گونجاوە یان نا.

خانەی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردن دیاریکە و پاشان دابەشبکە.

٢ ٦⟌٣٨ ٣ ٤⟌٨١ ٤ ٢⟌١٨٢

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

خانەی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردن دیاریکە و پاشان دابەشبکە.

٥ ٦⟌٤٥ ٦ ٣⟌١٢٥ ٧ ٥⟌٥٥٨

دابەشبکە.

٨ ٢⟌٨٧ ٩ ٤⟌١٨٩ ١٠ ٥⟌١٧٠

١١ ٤٦٢ ÷ ٩ ١٢ ٦٩٤ ÷ ٥ ١٣ ٩٦٩ ÷ ٦

١٤ فریاد هەندیٚ پێداویستی بۆ پڕۆژە هونەرییەکانی کڕی، چەند پاکەت بۆیە بە نرخی ٢٦ هەزار دیناری و قەڵەمی ڕەنگا ورەنگ بە نرخی ٢٣ هەزار دیناری کڕی، بڕی ١٠٠ هەزار دیناری دا بە فرۆشیارەکە. ئایا فرۆشیارەکە چەندی بۆ گێراوەتەوە؟

١٥ تیپێك لە قوتابیان بەسەر ٦ کۆمەڵەدا دابەش بوون. هەر کۆمەڵەیەك هەمان ژمارەیان لە وێنە کێشا. کۆی گشتی وێنەکان ١٤٤ وێنە بوو،ئایا ژمارەی ئەو وێنانەی کە هەر کۆمەڵەیەك تەواویان کردووە ٢٤٤ وێنەیە یان ٢٤ وێنە یان ٢ وێنەن؟ باسبکە.

١٦ هەر قوتابییەك لە قوتابییەکانی مامۆستا دیار پڕۆژەیەکیان پێشکەش کرد کە پێك هاتووە لە ٤٨ پەڕە، ئەگەر ژمارەی قوتابیان ٢٤ بێت، مامۆستا دیار چەند پەڕە دەپشکنیٚ؟



١٧ **بنووسە** باس بکە چۆن خانەی ڕەنووسی یەکەم لە پرسیاری دابەشکردندا دیار دەکەی؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

١٨ ٣ × ٣ × ٢

١٩ ٦٠٠ − ٧٩

٢٠ ئەنجامی لێکدانی ١٦ جاران ٤ بنووسە.

٢١ سەرجەمی ٧٠٦ + ٥٢٢ بنووسە.

٢٢ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە شانۆگەرییەك لە ٧:١٥ د.ن بۆ ماوەی ٩٠ خولەك دەستپێکرد، لە ناوەڕاستدا بۆ ماوەی ١٥ خولەك پشووی تێدابوو. لە چ کاتێکدا شانۆگەرییەکە کۆتایی هات؟

أ ٨:١٥ د.ن ج ٩:٠٠ د.ن

ب ٨:٤٥ د.ن د ٩:١٥ د.ن

**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٤⟌٢٨  ٢ ٤⟌٣٦

٣ ٢⟌٦٣  ٤ ٢⟌٢٢

٥ ٤⟌٤١

# سفر لە ئەنجامی دابەشکردن
# Zero in Division

## فێربە

نامەبەرێك ٤٣٢ جار لە ماوەی ٤ کاتژمێردا وەستا، چەند جار لە ماوەی کاتژمێرێکدا وەستاوە؟

### نموونە

٤٣٢ بەسەر ٤ دا دابەشبکە. بنووسە ٤⟌٤٣٢ .

**هەنگاوی ١**

خانەی ڕەنووسی یەکان لە ئەنجامی دابەشکردن بخەمڵێنە.

بیربکەوە: ٤⟌٤٠٠ = ١٠٠

٤⟌٤٣٢ کەواتە، ڕەنووسی یەکەم دەکەوێتە خانەی سەدان.

**هەنگاوی ٢**

٤ سەدی بەسەر ٤ دابەشبکە.

```
   ١
٤⟌٤٣٢
  ٤ -
  ---
  ٠
```

**هەنگاوی ٣**

٣ دەیی بهێنە خوارەوە.
٣ دەیی بەسەر ٤ دابەشبکە.

```
   ١٠
٤⟌٤٣٢
  ٤↓ -
  ---
  ٠٣
   ٠ -
  ---
   ٣
```

٣ > ٤، کەواتە سفرێك لە ئەنجامی دابەشکردن بنووسە

**هەنگاوی ٤**

٢ یەکان بهێنە خوارەوە.
٣٢ بەسەر ٤ دا دابەشبکە.

```
   ١٠٨
٤⟌٤٣٢
  ٤ -
  ---
  ٠٣
   ٠ -
  ---
   ٣٢
   ٣٢ -
  ---
    ٠
```

کەواتە، نامەبەرەکە لە ماوەی کاتژمێرێکدا ١٠٨ جار وەستاوە.

## دانانی سفر لە ئەنجامی دابەشکردندا placing zeros in quotient

قوتابییانی پۆلی چوارەم گەڵای درەختەکانیان کۆکردەوە. هەر ٤ گەڵایان لەسەر پەڕەیەکی تێنووسی زانستەکان دانا.

تیپی ڕۆژان ٢٤٠ گەڵایان کۆکردەوە، پێویستیان بە چەند پەڕە هەیە؟

```
ڕۆژان
    ٦
٤⟌٢٤٠
  ٢٤ -
  ----
   ٠
```

- هەڵەی ڕۆژان دیار بکە.

کرداری دابەشکردنەکە بە ڕێگایەکی ڕاست بنووسە.

تیپی سازان ٤١٢ گەڵایان کۆکردەوە، پێویستی بە چەند پەڕە هەیە؟

```
سازان
    ١٣
٤⟌٤١٢
  ٤ -
  ---
  ١٢
  ١٢ -
  ---
   ٠
```

- هەڵەی سازان دیاربکە.

کرداری دابەشکردنەکە بە ڕێگایەکی ڕاست بنووسە.

**لەبیرت نەچێ** خەملاندن بەکاربهێنە تا ژمارەی ڕەنووسەکان لە ئەنجامی دابەشکردن دیاربکەی، وە بۆ ئەوەی دانانی سفرەکان لەبیر نەکەی.

## ساغبکەوە

**١** باس بکە چۆن خەمڵاندن یارمەتی لە بیر نەکردنی دانانی سفر لە ئەنجامی دابەشکردن دەدات.

**ژمارەی ڕەنووسەکان لە ئەنجامی دابەشکردن بنووسە.**

**٢** ٣⟌٤٠٦ **٣** ٧⟌٦١٠ **٤** ٥⟌٣٠٩

**دابەشبکە و ساغبکەوە.**

**٥** ٥⟌٨٠٠ **٦** ٩⟌٣٠٨ **٧** ٣⟌٦٠٩

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**ژمارەی ڕەنووسەکان لە ئەنجامی دابەشکردن بنووسە.**

**٨** ٨⟌٨١٨ **٩** ٦⟌٥١٠ **١٠** ٣⟌٢٠٧

**دابەشبکە و ساغبکەوە.**

**١١** ٦⟌٤٠ **١٢** ٨⟌٦٠ **١٣** ٩⟌٩٥١

**+ یان − یان × یان ÷ لە شوێنی ● دابنێ.**

**١٤** (٣٥ ● ٥) ● ٥ = ٢ **١٥** (٩ ● ٨) ● ٤ = ١٨ **١٦** (٣٦ ● ٤) ● ٣ = ٢٧

**پێدراوەکان بەکاربهێنە** خشتەکە بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانی ١٧ و ١٨.

**١٧** جوان ٣ قوتووی بە پۆستەدا نارد کێشی یەکەم ٥ کگم، و دووەم٧ کگم، و سێیەم ١٨ کگم بوو، چەند پارەی داوە بۆ ناردنی قوتووەکان؟

**١٨** شۆخان ١٤٠ هەزار دیناری پێیە، ئایا ئەو بڕەیە بەسە بۆ ناردنی قووتوەك کە کێشەکەی ١٣ کگم بە پۆستە؟ناردنی ئەو قوتووە چەندی پێویستە؟

**نرخی بارکردن**

| کێش بە کگم | بەهای کیلۆگرامێك |
|---|---|
| لە ١ تا ٥ | ١٤ هەزار دیناری |
| لە ٦ تا ١٠ | ١٣ هەزار دیناری |
| لە ١١ تا ١٥ | ١١ هەزار دیناری |
| لە ١٦ تا ٣٠ | ٩ هەزار دیناری |

**١٩** هاوتا ٩٦٠ هەڵماتی لە ٨ ڕەنگی جیاواز هەیە، ئەگەر ژمارەی هەڵماتەکان لە هەر ڕەنگێك وەك یەك بن. ژمارەی هەڵماتە سەوزەکان چەندە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆتاقیکردنەوە

**٢٠** ئەو ژمارەیە بنووسە کە ١٠ ٠٠٠ ی کەمترە لە دووسە و پەنجا هەزار و سەد و شەست.

**٢١**
```
  ٦ ٩٨٣
- ٢ ٠٩٤
```

**٢٢**
```
  ٧ ٦٨٢
+ ٦ ٧٤٩
```

**٢٣** تەواویکە ٤ × ■ = ٣٠ − ٢.

**٢٤** ٤٠٠ − ٢٨٣ = ■

**٢٥** ئازاد ٨ کورسی کڕی و ٦٠٠ هەزار دیناری دا بە فرۆشیارەکە، ٨٠ هەزاری بۆ گێڕایەوە. نرخی هەر کورسییەك چەندە؟

أ ٥٠ هەزار دیناری ج ٢٥ هەزار دیناری

ب ٦٥ هەزار دیناری د ٤٥ هەزار دیناری

### پێداچوونەوەی خێرا

١) ٦ ÷ ٥٤   ٢) ٨⟌٦٤
٣) ٥⟌٦٥   ٤) ٩⟌٨٤
٥) ٧⟌٢٢٠

وانەی ٦

# ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان
## مانای ماوە
## Problem Solving Strategy
### Interpret the Remainder

تێبگە | پلاندابنێ | شیکاربکە | ساغبکەوە

ڕۆڵی ماوە لە **شیکاری پرسیار** ڕەوەز لەگەڵ کەسوکارەکەی لە ئاهەنگی جەژندا ئامادە بوو.

### نموونە

**أ** ماوەکە فەرامۆش بکە و ١ بۆ ئەنجامی دابەشکردنەکە زیادبکە.

ڕەوەز پێویستی بە ٢٥٠ شوشە ساردی هەیە. هەر سندوقێك ٦ شوشە دەگرێت، ڕەوەز پێویستە چەند سندوق بکرێت؟

٤١
٦⟌٢٥٠
٢٤ −
١٠
٦ −
٤

لەبەر ئەوەی ٤١ سندوق ٢٥٠ شووشە ناگرێت، ١ بۆ ئەنجامی دابەشکردنەکە زیاد بکە.
کەواتە ڕەوەز پێویستی بە ٤٢ سندوق هەیە.

**ب** ماوەکە فەرامۆش بکە.

ڕەوەز تۆپێك وەرەقەی پێیە کە درێژیەکەی ٢٥٠ سم، پارچە پارچەی کرد کە درێژی هەریەکەیان ٦ سم بوو. ڕەوەز چەند پارچەی لایە؟

٤١
٦⟌٢٥٠
٢٤ −
١٠
٦ −
٤

ماوەکە فەرامۆش بکە، ماوەکە بەس نییە بۆ پێکهێنانی پارچەیەکی تەواو.
کەواتە ڕەوەز ٤١ پارچەی لایە.

**ج** ماوە بەکاربهێنە وەك وەڵام.

دایکی ڕەوەز ١٢٦ پارچە شرینی بەسەر ٤ پاکێت دابەشکرد. ئەوەی ماویەوە دای بە ڕەوەز. چەند پارچە شرینی لای ڕەوەزە؟

٣١
٤⟌١٢٦
١٢ −
٦
٤ −
٢

ماوەکە بەکاربهێنە وەك وەڵام.
کەواتە، ڕەوەز دوو پارچەی بەرکەوتووە.

**لەبیرت نەچێ** کاتێك پرسیاری دابەشکردن شیکار دەکەیت، ڕۆڵی ماوە پەیوەستە بە ناوەڕۆکی پرسیارەکە.




### گفتوگۆ بکە

- بۆچی ژمارە ٤١ لە پرسیاری یەکەمدا بە وەڵامی ڕاست دانانرێت؟
- بۆچی لە وەڵامی پرسیاری دووەم واز لە ماوەکە دەهێنیت؟

**شیکاریکە. أ یان ب یان ج بنووسە بۆلێکدانەوەی ماوە.**

أ ١ بۆ ئەنجامی دابەشکردن زیادبکە  ب ماوەکە فەرامۆش بکە  ج ماوەکە بریتییە لە وەڵام

١ ڕووناک پێویستی بە ٩ سم شریت هەیە بۆ بەستنی قوتووی دیارییەکان. ئەگەر ٥٠ سم شریتی لا بێت، دەتوانێ چەند قوتوو ببەستێتەوە؟

٢ ڤیان دەیەوێت چەند پەڕێك بۆ ئەلبومی وێنەکانی بکڕێت، هەر پەڕێك ٦ وێنە دەگرێت، پێویستە چەند پەڕ بکڕێت تاکو ٩٤ وێنە بگرێت؟

٣ کۆمپانیایەکی بارزگانی ١٧٩ یاری ئەلیکترۆنی بەیەکسانی بەسەر ١٨ مەڵبەندی بازرگانیدا بەشییەوە، چەند یاری لا ماوە؟

٤ چاکەتێك پێویستی بە ٣ گلۆڵە خوری هەیە بۆچنینی، لە کارگەکەدا ٦٧ گلۆڵە هەیە، دوای ئەوەی کە زۆرترین چاکەتیان چنی، چەند گلۆڵە دەمێنێتەوە؟

## جێبەجێکردنی جیاواز

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** ستوونە ڕوونکردنەوەییەکان بەکاربهێنە بۆ شیکاری ڕاهێنانەکانی ٥ تا ٧.




٥ ٩٠٠ کارت بۆ ئەم ڤستیڤاڵانە چاپ کرا، ژمارەی کارتەنە فرۆشراوەکان چەندە؟

أ ٢٠  ب ٤٠  ج ١٢٠  د ١٤٠

٦ نرخی یەك بلیت ٥ هەزار دینارە، نرخی کارتەکانی چالاکی شیعر چەندە؟

أ ٥٠٠ هەزار دیناری  ج ١٠٠٠ هەزار دیناری

ب ٨٠٠ هەزار دیناری  د ١٢٠٠ هەزار دیناری

٧ بۆ بەشداری کردن لە هەریەك لە چالاکی مۆسیقا و شیعر دەبێ دوو کارت بکڕیت، وە بۆ چالاکی گۆرانی کارتێك و ٤ کارتیش بۆچالاکییەکانی وەرزش بکڕیت. کام لە چالاکییەکان زۆرترین جەماوەری هەیە؟

٨ **پرسیارێك بنووسە** کە شیکارەکەی پێویستی بە زیادکردنی ١ بۆ ئەنجامی دابەشکردنەکە بێت.

# پێداچوونەوە
# Review

## دڵنیا بوون لە زاراوەکان و چەمکەکان Check Vocabulary and Concepts

| | |
|---|---|
| لێکدان | Multiplication |
| دابەشکردن | Division |
| ماوە | Remainder |

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

١ ــــ؟ــــ ئەو ژمارەیەیە کە وازی لێدەهێنرێ کاتێك کرداری دابەشکردن بە تەواوی کۆتایی نایەت.

٢ کرداری ــــ؟ــــ بەکاردەهێنین کاتێك کۆمەڵێك شت بە یەکسانی دەبەشینەوە.

**بیریکەوە چۆن کرداری دابەشکردنی ٤٧ ÷ ٣ دەنوێنی بۆ شیکاری ڕاهێنانەکان لە ٣ تا ٦.**

٣ ژمارەی کۆمەڵە یەکسانەکان چەندە کە کرداری دابەشکردن دەریدەبڕێ؟

٤ وێنەی شەریتی دەبی بکێشە کە پێویستت پێیە بۆ ئەوەی بەشکراو بنوێنی.

٥ لە هەر کۆمەڵەیەکدا چەند هەیە؟

٦ لەدەرەوەی کۆمەڵەکان چەند ماوە؟

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان Check Skills

بەشبکە و ساغبکەوە.

٧ ٤⟌٦٥   ٨ ٥⟌٦٩   ٩ ٧⟌٩١

١٠ ٧⟌٩٠   ١١ ٥⟌٥٧   ١٢ ٧ ÷ ٨٩

بەهزر دابەشبکە و ئەنجامەکە بنووسە.

١٣ ٥ ÷ ١٥٠   ١٤ ٣ ÷ ٢١٠   ١٥ ٩ ÷ ٤٥٠٠

بە بەکارهێنانی ژمارەی گونجاو ئەنجامەکە بخەمڵێنە.

١٦ ٣ ÷ ١٣٦   ١٧ ٤ ÷ ٢٢٨   ١٨ ٦ ÷ ٤٩٢

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان Check Problem Solving

١٩ ٩٣ قوتابی بە یەکسانی بەسەر چەند تیپێکدا دابەشکران، ٥ قوتابی مانەوە، ژمارەی تیپەکان چەند بوو؟ هەر تیپێك چەند قوتابی لەخۆ گرتبوو؟

٢٠ بەهۆی باران بارینی زۆرەوە ٢٥٥ کەس خیوەتیان«چادر» بۆ هەڵدرا، بۆ هەر ٦ کەس خیوەتێك دانرا، ئایا هەموویان چەند خیوەتیان پێویستە؟ چەند کەس بەبێ خیوەت ماونەتەوە؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
# Standardized Test Prep

**ئاگاداربە! Tip!**

- هەمووووردەکارییەکان بخوێنەوە.
- دڵنیابە لە تێگەیشتنت بۆ پرسیار.
- وەڵامەکەت ساغبکەوە.

**وەڵامی گونجاو دەوربدە لە ڕاهێنانەکانی ١ تا ٩.**

١ ٢٩ ÷ ٤

أ ٧ م ١ — ج ٧
ب ٩ م ٣ — د ٩

٢ ٩⟌٧٤

أ ٨ م ٢ — ج ٩ م ١
ب ٨ م ١ — د ٧ م ٤

٣ ٥١١ × ٣٥

أ ٤ ٠٨٨ — ج ١٧ ٨٨٥
ب ١٦ ٧٧٥ — د جگە لەمە

٤ ٥٤١ + ١ ٩٨٠ + ٣٧

أ ٢ ٤٧٨ — ج ٩ ٠١٠
ب ٢ ٥٥٨ — د جگە لەمە

٥ ١ ٦٠٠ ÷ ٤

أ ٤ — ج ٤٠٠
ب ٤٠ — د ٤ ٠٠٠

٦ دارا بۆ گەشتێکی کەنار دەریا لە کاتژمێر ٩:١٠ پ.ن دەرچوو، لە کاتژمێر ١:٣٥ د.ن گەیشت، ماوەی ئەم گەشتە چەند بوو؟

أ ٣ ك و ٣٥ خ — ج ٤ ك و ٣٥ خ
ب ٣ ك و ٢٥ خ — د ٤ ك و ٢٥ خ

٧ ژمارەی نادیار کامەیە لەم ڕستەیە.
▢ ÷ ٦ = ٧٠٠؟

أ ٤٢ — ج ٤ ٢٠٠
ب ٤٢٠ — د ٤٢ ٠٠٠

٨ باشترین خەملاندن بۆ ئەنجامی دابەشکردنی ٧ ٦٥٤ ÷ ٩ کامەیە؟

أ ٨٠ — ج ٨٠٠
ب ٧٠ — د ٧٠٠

٩ ٧٩ گەنج ویستیان چەند تیپێك پێکبهێنن بۆ پێشبرکێ ی بەلەم، هەر تیپێك لە ٩ گەنج پێك هاتبێت، چەند گەنجیان کەمە تا هەموو تیپەکان تەواو بن؟

أ ٣ — ج ١
ب ٢ — د هیچ کەسێك

## ئەوەی دەیزانی بینووسە — Write What You Know

١٠ بەبۆنەی جەژن باوکی فێنك ١٢ ئەسپی هێنا بۆ ئەوەی گەشت بە منداڵان بکات، هەر ئەسپێك سێ منداڵ هەڵدەگرێت، ٥٠ منداڵیش چاوەڕوان دەکەن، ئایا هەموو منداڵەکان شوێنیان دەست دەکەوێت؟ چەند منداڵ چاوەڕوانی خولی دووەم دەکەن بۆ ئەوەی گەشتەکە بکەن؟

١١ لە پۆلی بیرکاریدا ٢٣ قوتابی هەیە شرۆڤە بکە چۆن دەتوانرێت دابەشی چوار کۆمەڵەیان بکەیت بۆ جێبەجێ کردنی چالاکییەکان.